بە یارمەتی‌ی ذەمینداریتی گشتی‌ی ڕۆشنبیری و لاوان لەچاپ دراوە

حەمە ساڵح فەرهادی

# چەندلایەنێکی

# ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی

بە یارمەتی ئەمینداریتی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان لەچاپ دراوە

حەمە ساڵح فەرهادی

# چەند لایەنێکی ڕۆژنامەنووسیی کوردی

١٩٨٨

چاپخانەی - الحوادث -

بغداد - ١٩٨٨

# پێشەکی

ئەوەد ساڵەی ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی تەمەنێکی کورت نی‌یە ، لەم ماوەیەدا پتر لــە ســەدو شەست ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی‌ی ئاشــکرای‌و دەیانیش بە نهێنی دەرچووە .

ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارانەش کــەم‌و زۆر هەموو لایەنەکانی ڕۆشنبیری‌و سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌ی کوردی گرتۆتەوەو زۆربەی تاقمە جیاوازەکانی میللەت هاوبەشی دەرهێنانیانی کردووەو بە ســەدان نووســەرو شاعیر بەرهــەمی هەمەجۆریان تێــدا بڵاو کردۆتەوەو بە دەیان ڕووناکبیریشمان زۆربەی ژیانی خۆی بۆ ڕۆژنامەنووسی تەرخــان کردەووەو هــەر لەم پێناوەشدا زۆر تەنــگ‌و چەڵەمەو گیروگرفتی هاتۆتە پێش .

ئینجا ڕۆژنامەنووسیێک ئاوا بێت‌و هێندە بابەت‌و لایەنی هەمە جۆری لێ جــودا بێتەوە پێویستە بـــە دەیـــان باس‌و لێــکۆڵینەوەی دەربارە بنووسرێت‌و بوختــەی ئەم کاروانە سەخت‌و درێژە بخرێتەوە بەر چاوی خوێنــەری ئێستا .

مــن ناڵێم هیچ هەنــگاو لــەم بارەوە نەنراوە ؛ بەڵــکو چــەند بەرهەمێــکی بە پێزو سەرکەوتوو تا ئێستا بڵاو کراونەتەوە بەڵام کورد

گۆتەنی ( ئەم هەویرە ئاو زۆر دەکێشێ ) و بواری ڕۆژنامەنووسیش زۆر لەمە پتر هەڵدەگرێ کە تا ئێستا بۆی کراوە .

ئەم کتێبەش بە کورتی چەند لایەنێکی ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی‌یەو هەموو لایەنەکانی نی‌یە ، ئەو بابەتانەی کە لێرەدا دەخرێنە پێش چاو ئەمانەن :

یەکەم : ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسی لە دەفتەری ڕووناکیرو گەورەپیاواندا : کۆمەڵێك وتەی بەنرخن دەربارەی ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسی .

دووەم : ڕۆژنامەی کوردستان‌و سەرەتای کاروانی ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی .

سێیەم : بەخشانی ڕۆژنامەنووسی : سەرەتای بەخشانی ڕۆژنامەنووسی‌و هێنانەوەی چەند نموونەیێکی جیاواز لە ڕۆژنامەو گۆفارەکاندا .

چوارەم : ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی لە نێوان سەربەستی‌و یاساکانی چاپەمەنیدا : باس کردنی هەندێك لە یاسا چاپەمەنیەکان‌و سەردەمەکانی گەشەکردنی ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی‌و کورتە باسێکی ئەو ڕۆژنامەو گۆفارانەی کەوتوونەتە سنووری ئەو سەردەمانە .

پێنجەم : ڕۆژنامەی بە تەمەن : ئەو ڕۆژنامەو گۆفارانەی کە لە دە ساڵ‌و زیاتریش بەردەوام بوونە .

شەشەم : ڕۆژنامەی تەمەن کورت : ئەو ڕۆژنامانەی کە لە سێ ژمارە کەمترو ئەو گۆڤارانەی کە تەنیا یەك ژمارەیان لێ بلاو کراونەتەوە .

حەوتەم : ڕۆژنامەی فرە زمان : ئەو ڕۆژنامانەی کە بە سێ زمانو زیاتریش وتاریان بلاو کردۆتەوە .

هەشتەم : ڕۆژنامەنووسیی مامۆستایان : ئەو بلاوکراوانەن کە کۆمەلەو یەکێتیو جڤاتی مامۆستایان دەریان کردوون .

نۆیەم : ڕۆژنامەنووسیی قوتابیان : ئەو ڕۆژنامانەن کە ڕێکخراوو لێژنەکانی قوتابیان بلاویان کردۆتەوە .

دەیەم : ڕۆژنامەنووسیی خوێندنگاکان : ئەو ڕۆژنامانەن کە لە قوتابخانەو زانکۆکان دەرچووینە .

یازدەم : ڕۆژنامەنووسیی مندالان .

دوازدەم : ڕۆژنامەی دەستنووس .

سێزدەم : سەرداناوەیەك بۆ ڕێبەرە نەمرەکانی کاروانی ڕۆژنامەنووسیی کوردی .

ئەوەی شایانی باسە کورتە باسێکی هەموو ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەمان کردووە کە کەوتوونەتە سنووری ئەو بابەتانەی کە باسمان کردوونو ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەی کە نەکەوتوونەتە سنووری ئەم بابەتانەشیو لەسەریان نەدواوین ئەوە ناگەیەنێ کە ئەمانە دەوریان لەوانی

دیکە کەمتر بووە ؛ بۆ وێنە : ڕۆژنامەی تێگەیشتنی ڕاستیو ڕاپەڕینو برایی ١٩٦٧و پاشکۆی عیراقی ١٩٨٧و گۆفاری ڕۆژی کوردو ڕوناکیو زاری کرمانجیو دەنگی گێتی تازەو نزارو هەتاوو ئۆنۆنۆمیو کاروانو چەندانی دیکەش دەوریان زۆر لە ڕۆژنامەیێکی تەمەن کورتی یەك دوو ژمارەیی زیاتر بووە کە لەم کتێبەدا لەسەریان دواوینو هۆیەکەش تەنیا هەر ئەوەیە کە ئەمان نەکەوتوونەتە سنووری ئەو بابەتانەی کە نەخشەی کتێبەکەی بۆ کێشراوە •

لە کۆتایی کتێبەکەمندا دوو پێرستی ڕۆژنامەو گۆفارە کوردیەکمانمان ئامادە کردووە : یەکەمیان بە پێی ساڵی دەرچوونو دووەمیشیان بە پێی شوێنی دەرچوونیان •

هیوا دارم کەمێك توانیبێتم خزمەتی کاروانی شکۆمەندی ڕۆژنامەنووسیی کوردیم کردبێتو ئەم دیاریە بچووکەش کەلێنێکی لەخۆی بچووکتر لە کتێبخانەی کوردی پڕ بکاتەوەو هەنگاوی دیکەشی بە دواوە بێتو نووسەرانیش لەم لایەنە ڕۆشنبیریە گرنگەدا زیاتر قەڵەمی خۆیان بخەنە کارو بە تێرو تەسەلی دەربارەی هەموو لایەنەکانی ڕۆژنامەنووسیی کوردی باسو هەڵسەنگاندنو لێکۆلینەوەی خۆیان پێشکەش بە خوێنەرانی کورد بکەن ••• چاوەڕوانین •

**حەمە ساڵح فەرهادی**

**هەولێر**

## ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسی

## لە دەفتەری ڕووناکبیرو گەورەپیاواندا

ئەوانەی دەربارەی ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسی دواون زۆرن ؛ هەندێك لەمانە سەرکردەو کاربەدەستی گەورە بووینەو هەندێکیشیان نووسەرو ڕووناکبیرو نیشتمانپەروەر ، هەر کەسە بە پێی بۆچوونی و بیرکردنەوەی خۆی قسەی لێ کردووەو ڕای خۆی دەربارەی دەربڕیوە ، هەیە بە چوارەمین دەستەڵاتی داناوە(1) ، هەشە ئەوەندە لە سوپاو هێرشی دوژمنی نەترساوە دە هەندە لە نیرەی قەڵەمی ڕۆژنامەنووسی نەترس ترساوە .

هەیە ڕۆژنامەی وەکو خۆراکو خواردنەوە بە پێویست زانیوە بۆ کۆمەڵو هەیشە چەندی لە توانایدا بووبێت کۆمەڵی لێ بێ بەش کردووە .

هەیە بەوپەڕی سنگ فراوانیەوە ڕەخنەی ڕۆژنامەکانی وەرگرتووەو چارەسەری دیاردە ناڕێکەکانی کردووە ، هەشە بە زیندانو داخستن وەڵامی ڕۆژنامەنووسو ڕۆژنامەکانی داوەتەوە .

به نیازی زیاتر ڕوونکردنەوەی ئـەو بیرو ڕایانەی دەربارەی ڕۆژنامەو پیشەی پیرۆزی ڕۆژنامەنووسیەوە وتراون ئەم چەند ڕازو ڕایانەی خوارەوە دەخەینە بەر چاو(٢) :

**گاندی ( ١٨٦٩ ـ ١٩٤٨ ) دەڵێ :**

ئەو کەسەی ڕۆژێ ڕۆژنامەیێك نەخوێنێتەوە بە نەزانی دادەنێم •

**ڕۆزفەلت (١٨٨٢ ـ ١٩٤٥)ی سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا دەڵێ :**

دەبێ لـە نێوان هەر دە کەس نووسەرێـکی ڕۆژنامەچی لـــەم وڵاتەدا هـــەبێت •

**ناپلیۆن ( ١٧٦٩ ـ ١٨٢١ ) دەڵێ :**

ڕۆژنامە بەرزترین پایەیە کە شارستانیەتی‌و ئاوەدانی لەســەر دادەمــەزرێ •

**ڤۆلتیر ( ١٦٩٤ ـ ١٧٧٨ ) دەڵێ :**

ڕۆژنامە هـــۆی نوێ کردنەوەی جیهـــانەو تـــەمی نـەزانین دەڕەوێنێتــەوە •

**کـارلیل دەڵێ :**

ڕۆژنامەنووس ئەگەر سەرکردەیێکی ڕای گشتی بێت یاخود ئەو نەبێ ، بەڵام ئایا یەکێك نیە لە کاربەدەستانی گێتی ؟•

**سەعد زەغلوول ( ١٨٥٧ ـ ١٩٢٧ ) دەڵێ :**

پێویستە ئێمـە لـە ڕەخنە لێ‌گرتنی ڕۆژنامەکان تووڕە نەبین ،

بەڵکو دەبێ خۆمان وا لێ بکەین کە ملوەی ئەوە نەمێنێ ڕەخنەمــــان لێ بــــگرن •

**ناپلیۆن دەڵێ :**

سێ ڕۆژنامە لە سەد هەزار سەرباز زیاتر دەمترسێنن •

**(دیاز)ی سەرکۆماری پێشووی مەکسیك دەڵێ :**

حەز دەکەم خاوەنی ئەو کارگایانە بوومایە کە کاغەزو مەرەکەب دروست دەکەن تاکو هەموویانم بسووتاندایە !•

**چیفرسنی سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا دەڵێ :**

گەلێك لام خۆشترە لە وڵاتێکدا بژیم ڕۆژنامەی هەبێتو یاسـای نەبێت ، نەك لە وڵاتێکدا یاسای هەبێتو ڕۆژنامەی نەبێ •

**کاسترۆی سەرۆکی پێشووی فەنزەویللا دەڵێ :**

لە دەرگەوانی دۆزەخ ناترسم ، بەڵام لە ئاستی ڕۆژنامەنووسێکدا دەلـــەرزم •

**( پول فالیری ) دەڵێ :**

پێویستە قوتابیانی قوتابخانەکان فێر بکەین کە ڕۆژنامە بخوێنەوە ، چونــکە گەل ئەگەر خۆی فەرمانڕەوا بێت دەبێ ئەو فەرمانڕەوایە هەموو ڕۆژێك ڕاپۆرتێك دەربارەی وڵاتەکەیو باری گێتی وەربگرێ ، ئــەم ڕاپۆرتەش لــە ڕۆژنامەدا هەیە ، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە گـەل بزانێت چۆن ئەم ڕاپۆرتە دەردێنێ •

**عیززەددین فەیزی ( ١٩١٧ ـ ١٩٨٥ ) دەڵێ :**

ڕۆژنامــە دەبێ بیرو بلوەڕی خۆی بە سـەربەستی بنووسێ ، هەوڵ بدا بۆ پەیداکردنی نووسینی باشتر ، بێتە ڕەهبــەرێك بۆ پێشخستنی کۆمەڵایەتی‌و پیشاندانی ڕێـگاو ڕەوشتی باش ، دەبێ بێتە چاودێر لەسەر کردەوەی کاربەدەستان ، چاکەو خراپەیان بۆ میللەت بڵاو بـکاتەوە .

**( ئەحمەد لوتفی )ی ڕۆژنامەنووس دەڵێ :**

بگەڕێمەوە تافی گەنجیم هەر دەبمەوە بە ڕۆژنامەنووس .

**تۆلستۆی ( ١٨٢٨ ـ ١٩١٠ ) دەڵێ :**

ڕۆژنامە مۆسیقای ئاشتیە ، دەنـگی‌میللەتە ، شمشێری ڕاســتیە ، پەنای کلۆڵانە ، لغاوی دەمی زۆردارانە ، لەرزێنەری تەختی‌ڕفەیسەرو زۆردارانـــە .

**( محەممەدی مەلا کەریم )ی نووسەرو ڕۆژنامەنووس دەڵێ :**

ڕۆژنامە پێوەندیێکی پتەوی بە دیموکراتیەتەوە هەیەو ڕۆژنامەنووس بەبێ ژیانی دیموکراتی ناتوانێ ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ بگەیەنێ .

**( دوکتۆر عەبدوللەتیف هەمزە ) دەڵێ :**

ڕۆژنامــە نووس دەتوانێت شتی سەیرو سەرسووڕێنـەر دروست بـکات ، لە هەمان کاتیشدا چەکێکی مەترسێنەری کاریگەرە ئەگەر هاتوو لە کۆشی ئازادی‌و دیموکراتیدا پەروەردەو گۆش کرابێت‌و پشـــتێکی نەکۆڵی هەیە لە ڕێـگای بەدیهێنانی ئامانجە نەخشکراوەکانی .

**ڤۆلتێر دەڵێ :**

ڕۆژنامەنووس دەزگایێکە بە کەس ناشکێ ، بەڵام ئەو جیهانی کۆن دەڕووخێنێ بۆ ئەوەی جیهانێکی نوێ دابمەزرێنێ •

**( جۆن هو هەنبەرگ ) دەڵێ :**

ڕاستـــە ڕۆژنامـە گیانو لەشە بەڵام کۆمەڵانی خـــەڵك دڵــە زیندووەکەیێتی ، هەر ئەوانن ژیانو گەرمایی بە گیانو لەشەکە دەبەخشن چونـکە هەر ئەوانن ڕێبازو ڕەوتی ڕۆژنامەنووس دەستنیشان دەکەن •

---

(١) یەکەمین جار ئەو زاراوەیە لە ساڵی (١٨٢٨) بەکار هێنراوە سێ دەسەڵاتەکەی دیکەش : دەستەڵاتی یاسادانان (السلطة التشريعية) و دەستەڵاتی جێبەجێ کردن ( السلطة التنفيذية ) و دەستەڵاتی قەزایی ( السلطة القضائية ) نە • بڕوانە : تێـــگەیشتنی ڕاستی لاپەڕە : ١٨ و ١٩ •

(٢) بۆ کۆ کردنەوەی ئەم وتانە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە :


١ ـ محەمەد حەسەن مەنگوڕی ـ گوڵەکانی ڕۆژگار ـ بەغدا ١٩٦٨ •

٢ ـ عوسمان شارباژێری گوڵشەن ـ چاپی کەرکووك ١٩٦٩ •

٣ ـ جەبار جەباری ـ مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی ـ چـــاپی کەرکووك ١٩٧٠ •

٤ ـ د• کەمال مەزهەر ئەحمەد ـ تێگەیشتنی ڕاستی ـ چاپی بەغـــدا ١٩٧٨ •

٥ ـ عیززەددین فەیزی ـ یەکێتی نووسەرانی کوردو دوو کۆڕ ـ چاپی هەولێر ـ ١٩٨١ و ڕۆژنامەی هەولێر ژمارە (١٢٣) ساڵی سێیەم ٩/ی حوزەیرانی ١٩٥٣ •

٦ ـ مومتاز حەیدەری ـ مستەفا شەوقیو پەیژە ـ چاپی بەغدا ١٩٨٥

٧ ـ ڕۆژنامەی بیری نوێ ـ ژمارە ٢٨٨ ٢٢ی نیسانی ١٩٧٨ •

٨ ـ فائق بطي ـصحافة الاحزاب وتاريخ الحركة الوطنيةـ بغداد ١٩٦٩

٩ ـ يعقوب يوسف گوريا : حكايات عن الصحافة في العراق بغداد ١٩٦٩

# ڕۆژنامەی کوردستان‌و

# سەرەتای کاروانی ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی

ڕۆژنامە لایەنێکی گرنگ‌و کاریگەری ژیانی ڕۆشنبیریە ، دیاردەیێکی دیاری شارستانی‌و پێشکەوتنە ، نیشانەی هوشیاری‌و دڵسۆزیە ، هەست کردنە بە ماف‌و ئامانج‌و پێداویستەکانی گەل ، پێویستیێکی ژیانی هاوچەرخی ڕۆژانەیە ، هاوەڵی نزیکی هەموو ڕووناکیرو هۆشمەندێکە ، هۆیێکی کاریگەری ڕاگەیاندنە ، ڕێگایێکە بۆ نزیك بوونەوەو گەیشتن بە جەماوەر ، سەرچاوەیێکی باوەڕ پێکراوە بۆ دەنگ‌و باس‌و هەواڵ وەرگرتن •

میللەتی کورد تا ئاخەلێوەی سەدەی نۆزدەم ڕۆژنامەی نەبووە ، یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی لە ساڵی (١٨٩٨) دەرچووە ، هەرچەندە نەتەوەکانی دراوسێی کورد بەر لەم ماوەیە ڕۆژنامەیان دەرکردووە(١) •

ڕۆژی ٢٢/ی نیسانی ساڵی (١٨٩٨) سەرەتای دەست پێ کردنی کاروانی شکۆمەندی ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردیەو ڕۆژنامەی کوردستانیش هەنگاوی یەکەمینی ئەم کاروانەیە •

# كردستان

١٣١٥

حيبي كاغذيك في ويكه
دفي ويكيت مصري سر
ناف خويي في جريده يي
لاو بدرخان پاشا
مقداد مدحت بكي
هرجار دوهزار جريده يا
بي بره آزي سنه و بكم
كردستاني ده بدين خلكي
پازده روژا جاركي تيت
تيساندن

عنوان
مصرده «كردستان» غزته‌سي
صاحب ومحرري بدرخان
پاشا زاده
مقداد مدحت
هر دفعه‌ده ٢٠٠٠ نسخه كردستان
ولايتلرينه ارسال وبونلر پاره‌سز
قرائتلرينه اعطا وتعميم اولنه جقدر

كردستان خارجنده اولنلر
ايچون سنه‌لك ابونه بدلي
٨٠ غروشدر
كردستان داخلنده مخصوص
اهاليسنه مجاناً گوندريلور

كردلري ايقاظ وتحصيل صنايعه تشويق ايچون شمديلك

اون بش گونده بر نشر اولنور كردجه غزته‌در

روژا پنجشي‌ده ٣٠ ذوالقعده سنه ١٣١٥ پنجشنبه في ٩ نيسان سنه ١٣١٤


بسم الله الرحمن الرحيم

صد هزار شكر وحمد ژ خدى تعالى‌ره آم مسلمان خلق كرن، وظائفا علم ومعرفتيره هش وزكا دامه . هر حتا عليمانديا علم ومعرفتيره گلك آيتين جليله واحاديث شريفه هنن دنيايده چقاس مسلمان هين گوند وبازيرين حياده مكتب ومدرسه وجريده هنن دنيايده چه دبه چه نابه جريده دخبين . حيفامن تيت ژكرداره كرد ژ گلك قوما زيده‌تر خويي هش وزكانه جامرن دينين خوده راست وقوينه خورتن وديسا وكه قومين دي نه خوندانه نه‌دزانن دنيايده چه دبه جيران وان موسقوف چاوه‌به وى چه بكه نظانن لوما ربا خدى‌ده من آف جريده باها ئيسي باذنا خدى تعالى پاش نهو هر پازده روژاده جاركي آزي جريده‌كي بنفيسم . ناف في من كريه (كردستان) في جريده‌يده آزي بحثا قنجيا علم ومعرفتا بكم لكودري مروف دخله لكودري مدرسه ومكتبين قنج هنه آزي نيشا كردا بكم لكودري چه شر دبه دولتين معظم چه دكن چاوه شر دكن تجارت چاوه دبه آزي حيا حكات بكم حتى نهو كسي جريده‌كي هولي نفيسي‌به آف جريده‌يا مناها باعولي‌به لوما وى گلك كيابي هبتن . ازهيفي دكم كيابا جريده‌يي ژمنره بنفيسن حمي تشت وكي نو چه دبن كيمن پاشي هنكي دچه دكوه ريده آفه ايدي آزي دست مقصدي بكم . (ومن الله التوفيق)

حضرت پيغمبر عليه الصلوة والسلام گوتي‌يه «العلماء ورثة الانبياء» آنكو علما وارثين انبيانه ژ طرف خدى‌ده مامورن وعظ ونصيحتي بدن خلكى ربا قنج نيشا وان بكن لوما گلي علمايين كردا چاوه اون وعظ ونصيحتا نيزى ددن ولى دفي اون مير وآغا وكرمانجين دنابين وان تشويقا ظانبا علم ومعرفتي بكن ربا قنج نيشا وان بكن هكي اون وى بكن گنجي حما سطى كيووه

دوکتۆر مارف خەزنەدار لە ڕۆژی ٢٢/ی نیسانی ساڵی (١٩٦٨) وتارێکی بەنرخی لە ڕۆژنامەی ( التآخي ) دا بڵاو کردەوەو ڕایگەیاند کە ئەو لە ئەنجامی پشکنین و توێژینەوە گەیشتۆتە ئەو ڕاستیەی کە یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی لە ٢٢/ی نیسانی ساڵی (١٨٩٨) دا بە ناوی ( کوردستان ) دەرچووە • دوکتۆر مارف هەر بەمەندەش نەوەستابوو ؛ بەڵکو وێنەی یەکەم ژمارەی ئەم ڕۆژنامەیەی بڵاو کردەوەو ئەوەیشی ڕاگەیاند کە ئەم ژمارەیەی لە نامەخانەی ( ڕۆژهەڵاتناسی ) لە ( لێنینگراد ) دیوەو هەر لەوێش پارێزراوە[٢] •

دوای نزیکەی چوار ساڵ بەسەر وتارەکەی دوکتۆر خەزنەدار دا دوکتۆر کەمال فوئاد زۆربەی ژمارەکانی ئەم ڕۆژنامەیەی لە کتێبێکدا بە ناوی ( کوردستان یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ١٨٩٨ - ١٩٠٢ ) لە بەغدا لە ساڵی (١٩٧٢) بڵاوکردەوە[٣] •

هەر وەك دوکتۆر کەمال ڕایگەیاندووە کە ئەو هەر لە هاوینی ساڵی (١٩٦٨)دا توانی ئەو ژمارانەی ڕۆژنامەی (کوردستان)ی دەست بکەوێت و لە ژمارە (١)ی گۆڤاری (ڕووناکی)ی ڕۆژی ٢٣/ی مایس ساڵی (١٩٦٩) دا ئەو ئاگاداریەی بڵاو کردۆتەوە[٤] •

ژمارە (یەك)ی ڕۆژنامەی (کوردستان) لە ٣٠/ی زیلقەعدەی ساڵی (١٣١٥)ی کۆچی بەرانبەر بە ٢٢/ی نیسانی ساڵی ( ١٨٩٨ )ی زایینی لە شاری (قاهیرە) دەرچووە •

ڕۆژنامەی ( کوردستان ) لە ماوەی چوار ساڵی تەمەنیدا (٣١) ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوەو لەم شوێنانەی خوارەوە :

زماره ١ـ٥ لـــه قاهیره

٦ـ١٩ له جنێف

٢٠ ـ ٢٣ جارێـکی دیکه له قاهیره

٢٤ لـــه لەندەن

٢٥ ـ ٢٩ له فۆلکستۆن

٣٠ ـ ٣١ جارێکی که له جنێف(٥)

دوا ژمارەی ڕۆژنامەی (کوردستان) زماره (٣١) بووه کـــه لـه ٦/ی موحـــەڕەمی ســاڵی (١٣٢٠)ی کۆچی بەرانبـەر به ١٤/ی نیسانی ساڵی (١٩٠٢)ی زایینی دەرچووه(٦) .

بەم جـۆره ڕۆژنامەی ( کوردستان ) بێجگه لەوەی کـه یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیه ؛ ڕەنـگه یەکەمین ڕۆژنامەی جیهانیش بێ کـه لـه ماوەی چوار ساڵدا پێنج جـار شوێنی دەرچوونی گوێزرابێتەوەو ســێ دەوڵەتی بێ کرابێ‌و جێی خۆیەتی بڵێین شوێنی دەرچوونی ئەم ڕۆژنامەیه هەردوو کیشوەرەی ( ئەفەریقاو ئەوروپا ) یه .

شێوەی زمانی ڕۆژنامەی (کوردستان) زاری کرمانجیی ژووروو ( زاراوەی جەزیرەو بۆتان ) بووەو به چوار لاپەڕەی (٥ر٢٥ × ٥ر٣٢) سانتیمەترو مانـگی دوو جار به کاغەزێـکی باش‌و به پیتی عـــەرەبی‌و لەسەر شێوەی نووسینی خەتی فارسی دەرچووه(٧) .

ڕۆژنامەی ( کوردستان ) له سەرەتاوه له لایەن ( میقـداد مەدحەت بەگ )ی نەوەی ( بەدرخان پاشا )و پاشانیش لــه لایەن( عەبدولرەحمان بەگ )ی برای دەرچووه(٨) .

ڕۆژنامەی ( کوردستان ) هەر لە یەکەمین ژمارەیەوە بایەخێکی زۆری بە خوێندنو خوێندەواری داوەو خەبلوەنی ڕۆژنامەکە چاك هەستی بەوە کردبوو کە هۆی سەرەکیی دواکەوتنی نەتەوەی کورد نەخوێندەوارییە • هەروەها ڕۆژنامەکە هانی پتەو کردنی گیانی نەتەوایەتی داوەو داوای بەرهەڵستی کردنی زوڵمو زۆرداری ( سوڵتان عەبدولحەمید )ی کردووەو هەوڵی بە هێز کردنی پێوەندی دۆستایەتیو برایەتی نێوان گەلی کوردو دراوسێکانی داوە بەتایبەتی لەگەڵ ئەرمەنییەکان •

ڕۆژنامەی ( کوردستان ) زۆر جار دەربارەی مێژووی بنەماڵەی ( بەدرخانییەکانو )و ( بەدرخان پاشا )ی گەورە وتاری بڵاو کردۆتەوەو زۆر جاریش هۆنراوەی نیشتمانیو بە تایبەتی هی ( حاجی قادری کۆیی )ی بڵاو دەکردەوە •

ڕۆژنامەی ( کوردستان ) وەنەبێ لە گۆشەیێکی تەسکەوە تەنیا هەر سەیری بەرژەوەندیی کوردی کردبێتو بەس ؛ بەڵکو بایەخێکی زۆریشی بە مەسەلەی نەتەوەکانی دیکەش داوەو هەمیشە بەرگریی لە ئازادیخوازە تورکەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی دەکرد ، هەر لەبەر ئەم ڕێڕەوو هەڵوێستە نەگۆڕاوەش بوو کە ڕۆژنامەکە نەیتوانیوە لە جێگایێك ئۆقرە بگرێتو هەمیشە بە ناچاری ئەم دەوڵەتو ئەو دەوڵەتی پێ کراوە(٩) •

ڕۆژنامەی ( بیری نوێ ) لە ڕۆژی ٢٢/ی نیسانی ساڵی (١٩٧٨) بە بۆنەی بیرەوەریی هەشتا ساڵەی ڕۆژنامەنووسیی کوردی لە وتارێکیدا بە ناونیشانی ( سەرەتای ڕێڕەوێکی پیرۆز ) دەربارەی ڕۆژنامەی ( کوردستان ) دەڵێ :

( ئەگەرچی ئـــەم ڕۆژنامەیە لە دەرەوەی کوردستان دەردەچوو هەروا لـە ماوەی چـوار ساڵدا تەنیا (٣١) ژمارەی لێ بڵاو کرایـــەوە ، بەڵام تا ڕادەیێـکی باش دەگـــەیشتە دەستی کۆمـــەڵانی خەڵـــکی کوردستان و(١٠) توانی دەورێـکی ئاشکرا بگێڕێ لـــە بڵاوکردنەوەی هوشیاری سیاسی و بەرگری کردن لـە خواست و ئاواتەکـــانی میللەتی کورد و پاراستن و پێشخستنی کەلەپوور و ڕۆشنبیریی • لـــە لایـەکی تریشەوە دەرچوونی ڕۆژنامەی کوردستان لـەو سەردەمەدا نیشـــانەی سەرهەڵدان و پەیدا بوونی هوشیاری سیاسی و نەتەوەیی و ڕزگاریخوازی یە لە مێژووی گەلەکەماندا •

نهێنی گرنـگی ئەم ڕۆژنامەیەو بڕوای تەواو بە سەرکەوتنی ئـەو مەسەلانەی تێـدا بڵاو دەکرانەوە لەو دڵسۆزی یەدا کۆ دەبێتەوە کە ئەو دەستە ڕۆشنبیرانەی لەو کاتەدا لە دەستی زوڵم و زۆرداری عوسمانیەکان کوردستانیان جێ دەهێشت و ڕوویان دەکردە وولاتانی تر لە گەلەکەیان دوور نەدەکەوتنەوە بەڵـکو بەپێرەوی شێوەیەکی تری تێکۆشانیان دەکرد کە ئەو کاتە باو بوو ، ئەویش دەرکردنی ڕۆژنامەو گەیاندنی دەنـــگی گەلەکەیان بە گەلانی دونیا کە لەو ڕۆژگارەدا بە هیچ جۆرێك نەدەتوانرا لە کوردستاندا بەرپا بـکرایە )(١١) •

---

(١) بۆ بەراورد کردنی مێژووی دەرچوونی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ( کوردستان ) لەگەڵ یەکەمین ڕۆژنامەی ئەو وڵاتانەی کە کوردی تێدایە ئەم زانیاریانە دەخەینە بەر چاو :

— یەکەمین ڕۆژنامە کە لە دەوڵەتی عوسمانیدا دەرچووبێ لـــە سالی (١٨٢٥) لە شاری (ئەزمیر) لە بە زمانی (فەڕەنسەیی) بووە •

• • • • • • • •

---

— یەکەمین ڕۆژنامەی تورکی لـە سـالی (١٨٣٢) بە ناوی ( تەقویمی وەقایع ) دەرچووە ٠

— یەکەمین ڕۆژنامەی فارسیش لە ئێراندا لـە سالی ( ١٨٥١ ) دەرچـووە ٠

— یەکەمین ڕۆژنامەش کە لە عیراقدا دەرچووبێ ڕۆژنامـەی ( الزوراء ) بووە کـە لە ١٥ی حوزەیرانی سالی ( ١٨٦٩ ) عوسمانییەکان بـە زمانی تورکیو عـەرەبی بلاویان کردۆتەوە ٠ ( بڕوانە : د٠ کەمال مەزهەر ـ تێـگەیشتنی ڕاستی ـ لاپەڕە : ٣١ ، ٤٦ ، ٤٧ ) ٠

(٢) بڕوانە : د٠ عیززەددین مستەفا ڕەسول ـ حول الصحافة الكردیةـ لاپەڕە : ١٩ ٠

(٣) ئەو ژمارانەی کە د٠ کەمال دەستی نەکەوتوون ژمارە ( ١٠ ، ١٢ ، ١٧ ، ١٨ ، ١٩ ) نـە ٠

(٤) د٠ کـەمال فوئاد ـ کوردستان یەکـەمین ڕۆژنامەی کوردی ـ چاپی بەغدا ١٩٧٢ پێشەکی ٠

(٥) هەمـــان سەرچاوە ٠

(٦) هەمـان سەرچاوە ـ پێشەکی ٠

(٧) د٠ عزالدین مصطفى رسول ـ حول الصحافة الكردیة ـ لاپەڕە:٢١

(٨) ژمـارە ١ـ٥ لـەلایەن میقـداد مەدحەتو ٦ـ٣١ یش لەلایەن عەبدولڕەحمان بەگی برای دەرچووە ٠

(٩) بۆ زیاتر ئاگاداری لە ناوەڕۆکی ژمارەکانی ئەم ڕۆژنامـــەیە بڕوانە : د٠ کەمال فوئاد ـ هەمان سەرچاوەی ناوبراو ٠

(١٠) خاوەنی ڕۆژنامەی کوردستان هەر جارەی (٢٠٠٠) دوو هـــەزار دانەیان بە خۆڕایی بۆ کوردستان دەنارد ٠

(١١) بیری نوێ ـ ژمارە ٢٨٨ ڕۆژی ٢٢ی نیسانی ١٩٧٨ لاپەڕە : ٣

## پەخشانی ڕۆژنامەنووسی

زمانی ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان هەر لە سەرەتای دەرچوونی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیو تاکو نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەش - هەروەکو هەموو چاپەمەنییەکی دیکەی کوردی - زمانێکی ڕەوانو کوردێکی پەتی نەبوودو وشەو زاراوەی بێگانەی زۆر تێدا بووە ؛ بەتایبەتی وشەی عەرەبیو تورکیو فارسی ، ئەم تێکەڵاوییەش جگە لە دراوسێتیو تێکەڵاو بوونی کورد لەگەڵ ئەم گەلانە هۆی دیکەشی هەبووە :

وشەی عەرەبی جێگای لەناو ئەدەبیاتی کوردیدا کردۆتەوە لەبەر ئەوەی زمانی عەرەبی زمانی قورئانو ڕۆشنبیریی ئیسلامەتیە لە هەموو ڕوویێکەوە .

وشەی تورکیش خۆی ئاخنیتە ناو زمانی کوردی چونکە زمانی تورکی زمانی ڕەسمیی دەوڵەتی عوسمانی بوو کە چەند سەدەیێك فەرمانڕەوایی بەشێکی گەورەی کوردستانی کردووە .

وشەی فارسیش جێگای خۆی کردۆتەوە چونکە سەردەمێك ئێران فەرمانڕەوایی بەشێکی کوردستانی کردووە .

جگە لەمانەش هەمووی متوربە کردنی هەر زمانێك بە وشەو زاراوەی زمانە زیندووەکانی دراوسێو جیهان تا ڕادەیێك شتێکی ئاساییەو واتای دواکەوتنو نارەسەنیی زمانەکە نیە .

ئەم دیاردەی تێکەلاو بوونی وشەی بێگانە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەمو نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەشدا وەنەبێ هەر بە تەنیا زمانی کوردی گرتبێتەوەو بەس ؛ بەڵکو زمانەکانی دیکەشی گرتبووەوە ، تەنانەت زمانی عەرەبیشی گرتبووەوە لەگەڵ ئەوەی زیاتر لە (١٣٠٠) ساڵیش بوو عەرەبو غەیری عەرەب خزمەتی زمانەکەیان دەکرد .

لەم بارەوە زانای عەرەبیزان ( ئەنستاس کەرمەلی ) دەربارەی زمانی ڕۆژنامە عەرەبییەکانی ئەو کاتی لە گۆڤاری ( الزهور )ی قاهیرەیدا لە ساڵی (١٩١١) نووسیویەتیو دەڵێ : ( زمانی ڕۆژنامەکانمان زمانێکە لەو پەڕی بێ پێزی دایەو تەنانەت یەکێکیان نابینی کە پێڕەوی زمانێکی عەرەبیی ڕەوانو دەستوورەکانی ڕێزمانی عەرەبی بکات ، ئەگەر لاپەڕەیێکی ڕۆژنامەیێك سەیر بکەیت نازانیت بە کامە زمان نووسراوەو ئەگەر لە خۆت بپرسیو بڵێی لەوانەیە خاوەن وتار بە زمانی تورکی یان کوردی یان فارسی یان هیندیو یاخود بە زمانی عەرەبیی گشتی دەنووسێ ، بەلام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەو بەم هەموو زمانانەی بە یەکەوە نووسیوە )[1] .

ئەم تێکەلاو بوونی وشەی بێگانە لە زمانی عەرەبیدا ناوی هەندێك ڕۆژنامەیشی گرتبووەوە ؛ بۆ وێنە : لە مانگی مایسی ساڵی (١٩١١) دا ڕۆژنامەیێکی عەرەبیی هەزەلی لە بەغدا بە ناوی (کرمەو نرمە)[2] دەرچووە ، ئەم ڕۆژنامەیە خاوەنەکەی ( لوتفی فیکرەت )و ( ئەحمەد

هادی )بوون(٣) • هەرچەندە مامۆستا (یەعقووب قەسساب) لە وتارێکیدا لــە گۆڤاری ( کاروان ) ئەم ڕۆژنامەیەی بــە ڕۆژنامەیێــکی کوردی داناوە(٤) ، بەڵام ڕاستیەکەی ڕۆژنامەکە عەرەبی بووە •

ئینجا بۆ ئەوەی پتر ئاگاداری سەرەتاو پەرەسەندنو پێشــکەوتنی پەخشانی ڕۆژنامەنووسی کوردی ببین چەند نموونەیێك دەخەینە بــەر چاوو هــەوڵی ئەوەشمان داوە کە نێوانی هەر نموونەیێكو ئەوی دیــکە ماوەیێکی کاتیی (١٥ــ٢٥) ســاڵ بێت :

**نموونەی یەکــەم :**

**ڕۆژنامەی کوردستان**

**ژمــــارە / ١**

**٢٢/ی نیسانی ١٨٩٨**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

صــد هزار شکرو حمد ژ خدی تعالی رە ام مسلمان خلق کرن • وظانینا علمو معرفتیرە هشو زکــا دامە • درحقا علماندنا علمو معرفتیرە گلك آیتین جلیلە واحادیث شریفە هنن دنیاییــدە چقاس مسلمان هبــن گوندو بازیرین حمیــادە مکتبو مدرسەو جریدە هنن دنیایدە چــە دبــە چــە نابە جریدە دنفیسن • حیفا مــن تیت ژ کردارە کرد ژ گلك قومــا زیدەتر خــوي هشو زکانە جامیرن دینین خوەدە راستو قوینە خورتنو دیسا وکــە قومین دي نەخوندانە نە دولمندن دنیاییدە چــە دبە جیران وان موسقوف چاوەیە وی چــە بــکە نظانن لوما ریا خــدیدە من اف جریدە یا دانفیسی باذنا خــدی تعالی پاش نهو هر پازدە روژا دە جارکي ازي جریدەکی بنفیسم •••••(٥) •

نموونەی دووەم :

### متانتو ثبات قوم کورد

**م• نوری**

قوم کورد قریب چوار هزار ســل لە پیش میلاددا لە شــرق دجلە یعنی لە موقع حاضرەدا هر بوەو زور دفعەش اثبـــات موجودیتی ملی خـــوی کردوە •

١٨ عصر لــە پیش میلاددا بــە موجودتیکی زۆرو انتظامیکی فوق العادە کلدانستانی اشغالو چنــد عصریك بە کمال دبدبە او جیکایانەیان ادارەو لویدا آثار مدنیتیان تأسیس کردوە • لپاشا لە طرف آتوریەکــانەوە بە هجومیکی ظالمانە او جیکایانەیان لی ســـندراوتەوەو موقعی خوشیان اشغال کراوە •••••(٦) •

نموونەی سێیەم :

### دواوانی زەلمو تانجەرو

**پیرە مێرد**

اوخ بویە مولویم خوش ئەوی‌و شیفتەو شەیدای سوزو نالەی ئەوم کــە پەردە ، پەردە شوینە شیرینەکانی خاکەکەمو نیشتمانەکــەمی بـــە فــەردی فردەوە ، بە فــەرو زیبیکی دل نەوەردەوە پینیشان داومو بـــە سینەما خوشەویستی ئەوانی چەسپاندوەتە سینەمەوە • (کوی آتشکا )ی وەك آتشکدەی ( زەردەشت ) لی هینامـــە تین‌و تاو ، ناو دلی برژاندم ، ( نیرەنــگی ) تافــگەو قەلبەزەی زەلمی وا بو کیشاوم دانەی مرواری بــە ســەردا پرژاندم ( بارك الله چەرخ هەی آفرین چەرخ ) ، پلوســـکەی (بافرە)ی عودالان وهەوای چەمی خواجایی تیگەیاندم ••••• (٧) •

## نموونەی چوارەم :

### بەهێزترین لە مردن

•••••• شورشگیریتی سیمایەکی دیاری ئەم سەدەیەیە لە ناو ئەو نەتەوانەدا بە ریگای ئازادی‌دا ئەرونو بە خوین ریگای سەربەستیان دیاری ئەکەنو پاشەروزی بەختیاری وەدەست ئەهینن ، شورشگیریتی نەتەوایەتی کوردی بەشیکی گەورەیە لەو شورشگیریتی‌یەی ئەمرو لە جیهان‌دا دەوری ژیانەوەو پیشکەوتن ئەخولقینی ، هەر وەکو چون جیگە لەق کردنو پەردە هەلمالینە لە رووی ئەو داگیرکەرانەی نەتەوەکان ئەچەوسیننەوە • بزووتنەوەی شورشگیریتیو تیکوشانی نەتەوایەتی میللەتی کورد بەشیکە لە شورشگیریتی مرۆڤایەتی هەموو ئادەمیزادو هەر سەر ئەکەوی چونکە بەهێزترە لە مردن(٨) •

## نموونەی پێنجەم :

### نووسەرو سەردەم

**د• ئیحسان فوئاد**

ئەو قسەیەی کە دەڵێ ( نووسەر لە سەردەمەکەی ناتوانێ جیا بێتەوە قسەیەکی بەجێو ڕاستە • گیانی سەردەم کە هەموو بەرەو پێشەوە مل دەنێت ، بەسەر هەموو نووسەرێكو شاعیرێکدا خۆی دەسەپێنێت ، بەڵام هەموو نووسەرو شاعیرێك فامو هەست پێکردنی مێژوویی واتە ( حیدسی مێژوویی ) نی‌یە •

سەردەم چی‌یە ؟ سەردەم دەورو بەرەو ڕەووشتەو خووی کۆمەڵایەتی‌و گۆڕانکاری‌ی سیاسی‌و نوێخوازی‌یە لە باری سەرنجی فەلسەفەو ژیانی کۆمەڵایەتی‌ی‌و ئابووری نەتەوەدا • ئەو پێویستی‌یەی ئەمڕۆ لە سەر شانی نووسەرو شاعیرە جیاوازە لەگەڵ پێویستی‌یەکانی ژیانی ماوەیەك لەمەو بەر •••• (٩) •

---

(١) فائق بطي / تطور المقال في الصحافة العراقية / دراسات عن الصحافة العراقية / بغداد ١٩٧٢ لاپەڕە : ٣١ •

(٢) واتە ( گەرمەو نەرمە ) بە پێی ڕێنووسی کۆنی ئەوسای کوردی‌و بە عەرەبی دەبێتە ( حار و ناعم ) •

(٣) بڕوانە : زاهیدە ابراهیم / کشاف الجرائد والمجلات العراقیة / بغداد ١٩٧٦ لاپەڕە : ١٤٥ •

(٤) بڕوانە : گۆڤاری (کاروان) ژمارە ١٦ کانوونی دووەمی ١٩٨٤ الصحافة الکردیة منذ نشأتها الی ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ لاپەڕە:١٥٥

(٥) بۆ تەواوی وتارەکە بڕوانە : دوکتۆر کەمال فوئاد / کوردستان یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی / لاپەڕە : ١

(٦) بڕوانە : جەمال خەزنەدار / ڕۆژی کوردستان / بەغدا ١٩٧٣ لاپەڕە : ١٧ •

(٧) بڕوانە : گۆڤاری ( گەلاوێژ ) ژمارە ٤ ساڵی ٤ نیسانی ١٩٤٣ لاپەڕە ٤ ، ٥ ، ٦ •

(٨) بڕوانە : ڕۆژنامەی (برایی) ژمارە ٤٠٦ شەموو ١٩/١٠/١٩٦٨ ساڵی دووەم / ڕێڕەوی برایی لاپەڕە : ١ و ٨ •

(٩) بڕوانە : ڕۆژنامەی (هاوکاری) ژمارە ٨١٣ پێنجشەممە ٧/١١/١٩٨٥ لاپەڕە : ٦ •

# ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی
# لە نێوان سەربەستی‌و یاساکانی چاپەمەنیدا

بەر لـە ساڵی ( ١٨٦٣ ) لە دەوڵەتی عوسمانیدا هیچ یاسایێـــکی تایبـەتی بۆ چاپەمەنیەکان نەبوو ؛ هەر لەم ساڵەدا یەکەمین یاســـــای چاپەمەنی دەرچوو(١) ، بۆیە جێی خۆیەتی کە هەنـگاوی یەکەمینی ئەم بابەتە لەم مێژووەوە بێت ؛ هەرچەندە ئەم مێژووەش (٣٥) ســــاڵ پێش دەرچوونی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیە ، ئەوەبوو بۆ یەکەمین جـار بە گوێرەی یاسا ڕاگەیاندرا کـــە دەبێ بۆ دەرکردنی هـــەر ڕۆژنامەیێك ڕێپێـدانی تایبەتی لە میری وەربگیرێ •

سوڵتان ( عەبدولحەمید ) پێش ئەوەی لەســـەر تەختی سوڵتانی دابنیشێ گرنگییەکی زۆری بە ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسی دەدا ؛ هەر لەبەر ئەوەش بوو لـە سەرەتای فەرمانڕەوایی ئەودا تاڕادەیێك سەربەستی بۆ ڕۆژنامەکان ڕەخسـا ، بەڵام ئەمـــە زۆری نەخایاند ؛ سوڵتانی پشــــوو تەنـگ نەیتوانی خـۆی بەرانبەر بە ڕەخنە زۆرەکانی ڕۆژنامە ڕابگرێ ، لەبەر ئەمـە فەرمانی بۆ سەرۆکی وەزیرانی دەرکرد کە دەبێ ڕۆژنامەکان

دەمکوت بکاتەوەو هەندێکیشیان دابخا ، بەڵکو بەمەش نەوەستاو لە ساڵی (١٨٧٧) دەستەیەکی چاوەدێریی لە بەڕێوەبەرایەتیی چاپەمەنیەکان داناو چەند ڕۆژنامەونوسێکیشی دوورخستەوە(٢) .

بەم جۆرە ڕۆژنامەنووسی لە دەوڵەتی عوسمانیدا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کۆتو پێوەندی نوێیو تازەتری بۆ دادەندراو خاوەن ڕۆژنامەکان ئاراستە کردنی تایبەتیان لە کۆشکی (یۆڵدز)ەوە بە هۆی بەڕێوەبەرایەتیی چاپەمەنیەکان بۆ دەهات و دەبوایە بە وردی پێڕەوی بکەن(٣) .

ئەم کۆتو پێوەندانە سەبارەت بە ڕۆژنامەکان هەر بەردەوامو لە زیادبووندا بوو ، لەم بارەوە ( دوکتۆر سینان سەعید ) لە کتێبی (دراسات في الصحافة العراقية ) دا لە زمانی ڕۆژنامەنوسی تورکی (ماجید جتین)دا دەربارەی ئەم چاوەدێرییەی کە ڕۆژنامەسی لە سەردەمی ناسراو بە ( مەشروتیەت ) واتە پێش ساڵی (١٩٠٨) دەڵێ : چاوەدێری شتێك بوو لە مافەتە دەچوو ، تەنیا هەر چاوەدێریش تاکە دەستەڵاتێك نەبوو ؟ بەڵکو لەگەڵ ئەمیشدا دوو بەڵای دیکەش هەبوون ئەوانیش : لێژنەی پشکنینو پۆلیسی نهێنی بوون(٤) .

پاشان دەڵێ : بەم جۆرە ڕۆژنامە نووسی ببووە پیشەیەکی گرانو پڕ مەترسیو ئاستی ڕۆژنامەکان بەرەو نزمی دەچوو دوای ئەوەی کە یەك لە دوای یەك دادەخران .

لە کۆتایی وتارەکەیشی دا دەڵێ : لەم ڕووەوە چەند تەعلیماتێك بۆ ڕۆژنامەکان دەرچوو ؟ لەمانە : دوورکەوتنەوە لە موناقەشە کردنی کاروباری ئایینیو بڵاو نەکردنەوەی نووسینی وەرگێڕاو لە زمانە

بێگانەکاندا ، هەروەها نابێ هیچ شتێك بە ناوی خوازراو بڵاو بکرێتەوە. سەرەڕای ئەمانەش لیستەیێکی لەم ناوو نازناوانەی تێدا نووسرابوو کە بڵاو کردنەوەیان لە ڕۆژنامەکاندا بە هەر جۆرێك قەدەغە بوو ؛ لەمانە : ( مان گرتن ، ڕەشەکوژی ، شۆڕش ، هاوبەشێتی ، دینامێت ، تەقینەوە ، ئاژاوە ، لەسەر تەخت لابردن ، کوشتار ، بۆسنە ، هرسك ، مەکدۆنیا ، کرێت ، قوبرس ، سەربەستی ، یەکسانی ، دەستوور ، نیشتمان ، یۆلدز )(٥) .

دیسان هەر ( دوکتۆر سینان ) لە زمانی مامۆستا (ڕۆفائیل بەتێ ) لە کتێبی ( الصحافة في العراق ) دا باسی ئەو تەعلیماتە نهێنیانەی کردووە کە ( سوڵتان عەبدولحەمید ) بۆ ڕۆژنامەکانی ناردبوو و ئەم خاڵانەی تێدا ڕوون کرابووەوە :

**یەکەم :**

پێش هەموو شتێك دەبێ گەل ئاگاداری لەش ساغیی خاوەن شکۆو گەورەمان پاشای مەزن بکرێ‌و پاشانیش باسی بەروبووەکشتوکاڵیەکان‌و پێشکەوتنی بازرگانی‌و پیشەسازی لە وڵاتدا بکرێ .

**دووەم :**

نابێ ڕۆژنامەکان هیچ شتێك بڵاو بکەنەوە کە ڕەزامەندیی وەزیری زانیاری لەسەر نەبێ .

**سێیەم :**

نابێ ڕۆژنامەکان وتاری درێژ بڵاو بکەنەوە ، هەرچەندە وتارەکە ئەدەبی‌و هونەریش بێ‌و بە هیچ جۆرێك نابێ وشەی (ماویەتی) لە دوای

وتارەکەدا بنووسرێ‌و واتای ئەوە بگەیێنی کە کۆتایی وتارەکـــە بۆ ژمارەیێـــکی دیـــکەیە •

**چوارەم :**

لەبەر ئەوەی بۆشایی بەجێ هێشتن‌و خاڵ ڕیزکردنی یەك لـــە دوای یەك لە وتاردا دەبێتە هۆی ئاژاوەو ماوەی قسەو قسەڵۆکی پـــێ دەدرێ نابێ بە هیچ جۆرێك بەکار بێن •

**پێنجـەم :**

نابێ مـــاوەی ئەوە بدرێ کـە تانە لە کەسایەتی بدرێ‌و ئەگـەر تاوانی دزی کردن یان بەرتیل یان کوشتن درایە پاڵ یەکێك لـــە والی یاخـــود موتەسەڕیفەکان نابێ ئاشکرا بکرێت ؛ چونـــکە ناتواندرێ ڕاستی‌ی ئەو جۆرە تاوانانە بسەلمێندرێ ، لەبەر ئەوە نابێ هەرگیز ماوەی بڵاو کردنەوەی ئەو جۆرە شتانە بدرێت •

**شەشەم :**

نابێ گـــەل لـــە بەد ڕەفتاری فەرمانبەرانی دەوڵەت ئاگادار بکرێ‌و هەرگیز ناشبێ باسی ئەوە بکرێ کـــە هیچ شکایەتێك لـــەم ڕووەوە بەرگوێ‌ی سوڵتان کەوتووە • لەبەر ئەوەی کە گەلەکەمان ڕاســـتگۆو ســـەر ڕاستە نابێ بە هیچ جۆرێك ئاگاداری ئەو هەواڵو تەقەلایانە بکرێ کـــە باسی کوشتنی پاشاکانی دەوڵەتە بێگانەکان دەکـــەن ؛ بۆ ئـــەوەی ئەم جۆرە هەواڵانە نەچێتە ناو ڕیزەکانی گەل(٦) •

دوای کۆدەتای عوسمانیەکان‌و لە ساڵی (١٩٠٩) دا یاسایێـــکی دیـــکە بۆ چاپەمەنیەکان دەرچوو کـــە بریتی بوو لە (٣٨) مـــاددەو

دابەشی سەر چوار بەشی سەرەکی کرابوو : بەشی یەکەمی تایبەت بوو بۆ چۆنیەتی بلاو کردنەوەو بەشی دووەمی دەربارەی سزادانو بەشی سێیەمی دەربارەی جنێوو تێهەڵدانو بەشی چوارەمیشی لە بابەتی هەمە جۆر پێك هاتبوو(٧) •

ئەم یاسای دوایە تا کۆتایی هاتنی دەوڵەتی عوسمانیو مردنی ( پیاوە نەخۆشەکە ) هەر کاری پێ دەکرا •

لە عیراقیشدا هەر لە سەرەتای ناوبراو بە فەرمانڕەوایی نیشتمانیو پێکهاتنی دەوڵەتی عیراقیو تاکو ساڵی ( ١٩٣١ ) هەر یاسا کۆنەکانی دەوڵەتی عوسمانی کاری پێ دەکرا(٨) ، لەم ماوەیەشداو لە سەردەمی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموودی نەمردا ڕۆژنامەنووسیی کوردی سەردەمێکی گەشەداری بەخۆوە بینیو لە نیوەی دووەمی ساڵی (١٩٢٢)و سەرەتای ساڵی (١٩٢٣) دەزگاکانی حوکمداریتی توانیان چوار ڕۆژنامەی سەرکەوتووی کوردانە پێشکەش بە کاروانی ڕۆشنبیریی نەتەوەکەمان بکەن کە ئەمانەن :

**١ ـ ڕۆژنامەی ( بانگی کوردستان )**

ڕۆژنامەیێکی زانستی ، کۆمەڵایەتی ، ئەدەبیی هەفتانە بووە بە زمانی کوردیو تورکیو فارسی دەرچووە •

خاوەنی ئیمتیازو بەڕێوەبەری لێپرسراوی / حاجی مستەفا پاشای یاموڵکی •

نووسەری بەشی کوردیو فارسی / عەلی کەمالو م• نوری •

نووسەری بەشی تورکی / ڕەفیق حیلمی •

شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ٢/ی ئابی ساڵی ١٩٢٢ دەرچــووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی کە ژمارە (١٤) بووە لە ڕۆژی ٢٧/ی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵ دەرچووە •

ئەم ڕۆژنامەیە زمانی فەرمانڕەوایەکەی شێخ مەحموود بووە •

جارێــکی دیــکە ئەم ڕۆژنامەیە لە بەغدا لە لایەن حــاجی مستەفا پاشاوە لە ساڵی (١٩٢٦) دەرچۆتەوەو لە ژمارە پازدەوە تاکو ژمـــــارە حەڤــدە بەردەوام بووە •

ئەوەی شایانی باســە مامۆستا ( جەمال خەزنەدار ) هـــــەموو ژمارەکانی ئەم ڕۆژنامەیەی کۆ کردۆتەوەو لە ساڵی (١٩٧٤) لــە لایەن بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیریی کوردی لە بەغدا چاپ کراوەتەوە(٩) •

## ٢ ـ ڕۆژنامەی ( ڕۆژی کوردستان )

ڕۆژنامەیێکی سیاسی ، ئەدەبی ، کۆمەلایەتیی ڕەسمی هەفتــانە بووە •

خاوەن‌و لێپرسراوی / م• نووری •
سەر نووسەری / عەلی کەمال •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ڕۆژی ١٥/ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٢ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی کە ژمارە (١٥) بووە لە ٣/ی ئاداری ساڵی ١٩٢٣ دەرچووە •

مامۆستا ( جەمال خەزنەدار ) هەموو ژمارەکانی ئەم ڕۆژنامەیەی کۆ کردۆتەوەو لە ساڵی ١٩٧٣ لە لایەن بەڕێوەبەرێتیی ڕۆشنبیریی کوردی بە ئۆفسێت چاپکراوە[١٠] .

٣ ـ ڕۆژنامەی ( بانگی حەق )

ڕۆژنامەیێکی سیاسیی هەفتانە بووە .

شوێنی دەرچوونی / سلێمانی ـ ئەشکەوتی جاسەنە .

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ٨/ی ئاداری ساڵی ١٩٢٣ دەرچووە .

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی کە ژمارە (٣) بووە لە نیسانی ساڵی ١٩٢٣ دەرچووە .

ئەم ڕۆژنامەیەش زمانی فەرمانڕەوایەکەی شێخ مەحموود بووەو لە ئەشکەوتی جاسەنەی ناوچەی سورداش چاپکراوە ، پاشان شێخ مەحموود ناچار کراوە کە ناوچەکە بەجێ بێڵێ‌و چاپخانەکەش کەوتە دەست ئینگلیزە داگیرکەرەکان‌و ڕۆژنامەکەش پەکی کەوت[١١] .

٤ ـ ڕۆژنامەی ( ئومێدی ئیستیقلال )

ڕۆژنامەیێکی ئەدەبی ، کۆمەڵایەتی ، ئابووری ڕەسمی بووە .

بەڕێوەبەری لێپرسراوو سەرۆکی نووسین / ئەحمەد سەبری ، ڕەفیق حیلمی ، ئەحمەد خواجە ، حوسێن نازم هەر یەکەیان ماوەیێك سەرۆکایەتی نووسینی ئەم ڕۆژنامەیان کردووە .

شوێنی دەرچوونی / سلێمانی .

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ڕۆژی ۲۰/ی ئەیلوولی ساڵی ۱۹۲۳ دەرچووە •
(۲۵) ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە •

ئەم ڕۆژنامەیە زمانی حوکمدارێتیی شێخ مەحموود بووە •

لەمەو پێش ڕامان گەیاند تاکو ساڵی (۱۹۳۱) لە عیراقدا هیچ یاسایێکی تایبەت بە چاپەمەنییەکان نەبوو ؛ ئەوە بوو هەر لەم ساڵەدا یاسای چاپەمەنییەکانی ژمارە (۸۲)ی ساڵی (۱۹۳۱) دەرچوو کە جێگای یاسای چاپەمەنییەکانی دەوڵەتی عوسمانی گرتەوە • ئەم یاسا نوێیەش لە جیاتی ئەوەی کەمێك سەربەستیی ڕۆژنامەنووسی بچەسپێنێ پتر تەنگی پێ هەڵچنیو چەند شەرتێکی تازەیشی دانا بۆ دەرکردنی هەر ڕۆژنامەیێك کە جاران ئەو شەرتانە لە یاسا چاپەمەنییەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا نەبوو(۱۲) •

یاسای ژمارە (۸۲) مافی دەست بەسەرداگرتنی هەموو چاپەمەنیێکی بە وەزیری ناوخۆ دا ؛ کەچی یاسای دەوڵەتی عوسمانی ئەو مافەی بە وەزیری ناوبراو نەدابوو •

بەم جۆرە ئەم یاسایە سەبارەت بە سەربەستیی ڕۆژنامەنووسی هەنگاوێك بوو بۆ دواوەو لە کۆتو پێوەندی نوێ بەم لاوە هیچ لایەنێکی باشی نەبوو(۱۳) •

ئەم یاسایەش لە ساڵی (۱۹۳۲) دا چەند گۆڕانکارێکی خرایە سەرو هەندێ شەرتی دیکەشی دانا لەوانە : ئەو کەسانەی کە داوای ڕێپێدانی دەرکردنی هەر ڕۆژنامەیێك دەکەن دەبێ بەلای کەمەوە دەرچووی قوتابخانەی ئامادەیی بنو تەمەنیشیان لە (۲۵) ساڵ کەمتر

نەبێ ، هەروەهـــا دەبێ بەڕێوەبەری لێپرســـراویش دەرچـــووی خوێندنــگایێکی بەرز بێو تەمەنیشی لە (٣٠)ساڵ کەمتر نەبێ[١٤] .

لە ساڵی (١٩٣٣) دا یاسایێــکی دیــکەی چاپەمەنیەکان بە ناوی یاسای ژمارە (٥٧)ی ساڵی (١٩٣٣) دەرچوو[١٥] ، ئــەم یاســـایەش لە ساڵی (١٩٣٤) دا چــەند گۆڕانکارێکی خرایە سەرو چەند ماددەیێکی کــەی خرایە پاڵ ؛ لەوانە : ماددەی دووەمی ئــەم یاسایە دەڵێ : ( نابێ یەکێك بێتە بەڕێوەبەری لێپرسراوی زیاتر لە یەك چاپەمەنی ، هەروەهـا نابێ بەڕێوەبەری لێپرسراوی چاپەمەنیێکی پەکخستراو بێتە بەڕێوەبەری لێپرسراوی چاپەمەنیێکی دیکە لە ماوەی پەکخستنەکەدا )[١٦] .

هەروەها دەقی مـاددەی سێزدەهەمی بەشی سزادانی ئـەم یاسـای چاپەمەنیە دەڵێ : ( هــەر کەسێك شتێکی وا بڵاو بکاتەوە کە میری یاخود سوپا بە کەم بزانیت ؛ سزای ئەو کەسە بەندی کردنە بە شەرتێك لە سێ ساڵ تێنەپەڕێو بە پێبژاردنیش ، یاخود بە یەکێك لەم دوانە ) .

دیسان دەقی بڕبڕەیێکی هەمان ماددە دەڵێ : ( هەمان سزای پێشوو بەســـەر ئەو کەسەدا دەدرێ کــە تانەیێك دژی باوەڕپێکراوی ســامیی بەریتانیا یاخود دژی هێزە چەکدارەکانی بەریتانیا دەکات کــــە لـــــە عیراقـــــدان )[١٧] .

لە ساڵی (١٩٣٦) دا گۆڕانکارێکی کە خرایە سەر یاسای سزادانی سەر بە یاسای چاپەمەنیەکان کە ئەویش گۆڕانکاریی ژمارە (٤٠) بوو کــە دەڵێ : ( هــەر کەسێك کاغەزێك یان شتێکی لێ بگیرێ کـــە بۆ بڵاوکردنەوە ئامادە کرابێ ؛ هەمان سزای بەســـەردا دەدرێ ئەگـــەر سەلمێندرا کــە بە نیازێکی خراپ پەیدای کردووەو بەتەمـــای بـڵاو

کردنەوەیەتی )(١٨) .

سەبارەت بە چۆنیەتی سەربەستیی ڕۆژنامەنووسی و یاسای چاپەمەنیەکان ڕۆژنامەی ( صوت الاهالي ) لە ڕۆژی ٣/ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٥٣) دا نوسیبووی : ( چیرۆکی یاسای چاپەمەنیەکان چیرۆکی دەستەڵاتو بەرژەوەندەی ئینگلیزە لە عیراقداو یەکێکە لەو چەکانەی کە بۆ بەرگری کردنی بزووتنەوەو قەڵەمە نیشتمانپەروەرەکانو پاراستنی بەرژەوەندەی بێگانەو ناپاکیو دەرەبەگایەتی بەکاری دەهێنێ )(١٩) .

لە ساڵی (١٩٥٤) دا نووری سەعید ئەم یاسا چاپەمەنیانەشی بەرانبەر بە گەل بە زۆر زانیو هەڵسا هەڵیوەشاندەوەو یاسایێکی کۆنەپەرستانە تری بۆ دانا ؛ ئەویش بە مەڕسوومی ژمارە (٢٤)ی ساڵی (١٩٥٤) ناسراوە ئەم مەڕسوومەش تاکو بەرپا بوونی شۆڕشی ١٤/ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨) هەر کاری پێ دەکرا ، بە پێی ئەم مەڕسوومە هەموو ڕۆژنامەو گۆڤارەکان داخرانو ئەو کەسانەی کە دەیانویست ڕۆژنامەکەیان بەردەوام بێت ؛ دەبوایە سەر لەنوێ داوایێکی دیکە پێشکەش بکەنەوە(٢٠) .

ئەم ماوەی ساڵانی ( ١٩٥٤ – ١٩٥٨ ) ە بە یەکێك لە سەردەمەکانی کزبوونەوەی ڕۆژنامەنووسیی کوردی دەژمێردرێ لە عیراقداو لەم ماوەیەدا نەك هەر نەدەبوایە باسی باری ئاڵۆزو دوا کەوتوویی کوردستانی عیراق بکرێ ؛ بەڵکو بە هیچ جۆرێك نەدەبوایە باسی باری نارێكو نالەباری بەشەکانی دیکەی کوردستانیش بکرێ ؛ هەرچەندە ئەم باس کردنە لەلایەن ڕۆژنامە عەرەبییەکانی عیراقیش بوایە ، لەم بارەیەوە جارێکیان بەڕێوەبەری لێپرسراوی ڕۆژنامەی ( صوت الاهالی ) مامۆستا ( عەبباس حەسەن جومعە ) حوکم درا لەسەر ئەو شکایەتەی کە بیرۆی

ئەوکاتی تورکیا بە هۆی باڵوێزخانەکەیەوە لە بەغدا لێی کردبوو لە سەر ئەو وتارەی کە ئەو لە ڕۆژی ١٥/ی تەمووزی ساڵی ( ١٩٥٤ ) دا دەربارەی سیاسەتی بە تورك کردنی بیرۆی تورکیا بەرانبەر بە کوردەکانی ئەوێ بڵاوی کردبووەوە[٢١] ، گوایە ئەمە هێرش بردنە بۆ سەر ( جەلال بایار ) ی سەرۆکی ئەوسای تورکیا[٢٢] .

ئەم یاسای ساڵی (١٩٥٤) ە بە تەواوی پێچەوانەی ماددەی دوازدەمینی دەستووری ئەوسای عیراق بوو کە دەیووت : ( عیراقیەکان سەربەستن لە ڕادەربڕینو بڵاوکردنەوەو دامەزراندنی کۆمەڵەکانو هاتنەناویان بۆی لە سنووری یاسادا )[٢٣] .

یاسای ساڵی (١٩٥٤) شەرتی ئەوەی دانا بۆ دەرکردنی هەر ڕۆژنامەیێك دەبێ ڕێپێدانی تایبەتی لە وەزیری ناوخۆ وەربگیرێ و هیچ دەستەڵاتێکیش مافی ئەوەی نیە کە هۆی ڕێ پێنەدان یاخود داخستنی هەر ڕۆژنامەیێك لە وەزیری ناوبراو بپرسێ ! بەڵکو وەڵام نەدانەوەی هەر داوایێك لەم بارەیەوە واتای ئەوەیە کە چاپەمەنیەکە نابێت دەربچێو خاوەنەکەیشی مافی ئەوەی نیە کە هۆی ڕێ پێ نەدانەکە بزانێت ، جگە لەوەش هیچ دادگاییکیش بۆی نیە سەیری ئەو جۆرە داوایانە بکات کە لەم بارەیەوە لە دژی ڕەفتارو هەڵسووکەوتی وەزیرەکە بەرز دەکرێتەوە[٢٤] .

سەبارەت بە یاسا چاپەمەنیەکانی پێش شۆڕشی ١٤/ی تەمووزی (١٩٥٨) مامۆستا ( فائیق بەتێ ) دەڵێ : ( کاربەدەستان لەم وڵاتەدا سەربەستیان خنکاندووەو تەسکیان کردۆتەوە ، هەر لە داگیرکردنەوە هەتا ئێستا سیاسەتی میری بەرانبەر بە سەربەستیی ڕۆژنامەنووی

لەسەر ڕێبازێکی نەگۆڕاو دەڕوا ؟ ئەویش کپ کردنەوەو دامرکاندنی خۆشەویسترین شتە کە مرۆڤ هەیەتی کە سەربەستیی وتن‌و نووسین‌و بلاوکردنەوەیە • لە مێژووی ڕۆژنامەنووسیدا زۆر جار ڕۆژنامەیێك داخراوە بێ ئەوەی شتێکی وای بلاو کردبێتەوە کە شایانی داخستن بێ ، جگە لە ئارەزووی وەزیرێك یاخود کاربەدەستێکی بێگانە نەبێ )(٢٥) •

هەروەها ماموستا ( یعقووب یووسف گۆریا )ش دەربارەی سەربەستیی ڕۆژنامەنووسیی هەمان سەردەمی پاشایەتی لە عیراقدا دەڵێ : ( زیاتر لە چارێك نووسیمان کە دەبێ سەربەستیی ڕۆژنامەنووسی بە تەواوی‌و بە گوێرەی یاسا جێ بەجێ بکرێ‌و لە هەموو خۆ هەڵقورتاندنێك دوور بێ ؛ بۆ ئەوەی گەلی عیراق بتوانێ بە تەواوی ڕای خۆی دەربڕێ‌و چی لە دەروونیدا هەیە بیڵێ ، بەلام میری ڕەزیلیی بەو مافە ڕەوایەی گەل دەکات‌و وامان لێ هاتووە گومان لە سیاسەتەکەی بکەین )(٢٦) •

ئا بەم جۆرە بیرۆی پاشایەتیی گۆڕکراو لە عیراقدا دەنگی ڕەسەن‌و وشەی پاك‌و قەڵەمی نەترسی کوردیی‌و عەرەبیان کپ دەکردەوەو گەلیان لە بچووکترین مافی ڕەوای خۆی بێ بەش دەکرد •

ئەم بارە ئالۆزە هەتا بەرپا بوونی شۆڕشی ١٤/ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨) بەردەوام بوو و بە بەرپا بوونی ئەو شۆڕشە گۆڕانێکی بنەڕەتی کەوتە ولات‌و گەلی عیراق بە کوردو عەرەب‌و کەمە نەتەوەیەکانەوە سەربەستیێکی تا رادەیێك چاکیان وەدەست هێناو دەرگای دەرکردنی چاپەمەنیی کوردیش کەوتە سەر پشت‌و کۆتایی ساڵی (١٩٥٨)و ساڵانی ( ١٩٥٩و ١٩٦٠) بە کاتێکی لەبارو سەردەمێکی

ژێرینی ڕۆژنامەنووسیی کوردی دادەندرێ لە عیراقداو لەم ماوەیەدا ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردیانە ڕووناکیان دیتەو وڵاتیشیان ڕووناک کردەوە :

**١ ـ گۆڤاری ( هیوا )(٢٧)**

گۆڤارێکی ئەدەبیو زانستی مانگانە بووە •

زمانی یانەی سەرکەوتنی کوردان بوو •

خاوەنی ئیمتیازی / مەحموود جەمیل بابان •

سەرۆکی نووسین / حافز مستەفا قازیو پاشانیش هاشم دۆغرمەچی •

شوێنی دەرچوونی / بەغدا •

مێژووی ماوەپێدانی ٩/٥/١٩٥٧ •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٥٧ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی کە ژمارە (٣٦) بووە لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ دەرچووە •

مێژووی داخستنی / لە ساڵی ١٩٦٣ داخراوە •

**٢ ـ گۆڤاری ( شەفەق ـ بەیان )(٢٨)**

گۆڤارێکی ئەدەبیو زانستیو کۆمەڵایەتی نیو مانگی بوو بە زمانی کوردیو عەرەبی دەرچووە •

خاوەنی / عەبدولقادر بەرزنجەیی •

شوێنی دەرچوونی / کەرکووك ـ سلێمانی •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ١٥/ی مانگی کانوونی

دووەمی ساڵی ١٩٥٨ دەرچووە •
لە ساڵی ١٩٥٩ ناوی گۆڕاوەو کراوە بە (بەیان) •
لە ساڵی ١٩٦١ گوێزراوەتەوە بۆ سلێمانی •

**٣ ـ گۆڤاری ( پێشکەوتن )(٢٩)**

گۆڤارێکی هەفتانەی گشتی بووە بە زمانی کوردیو عەرەبیدەرچووە
خاوەنی / محەمەد بریفکانی •
سەرۆکی نووسین / پارێزەر یوونس سەبباغ •
شوێنی دەرچوونی / بەغـــدا •
مێژووی ماوەپێدانی / ٢٧/ی تشـرینی دووەمی ســـاڵی ١٩٥٧
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ٢٨/ی شوباتی ســـاڵی ١٩٥٨ دەرچـــووە •
مێژووی داخستنی / لە ساڵی ١٩٦٣ داخراوە •

**٤ ـ ڕۆژنامەی ( برایەتی )(٣٠)**

ڕۆژنامەیێکی سیاسی ڕۆژانەی کوردی ـ عەرەبی بووە زمـــانی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە •
خاوەنو سەرۆکی نووسینی / خەسرۆ تەوفیق •
مێژووی ماوەپێدانی / لە ٨/ی ئاداری ساڵی ١٩٥٩ ئیمتیـــازی دراوەتێ •
مێژووی داخستنی/لە ١٣/ی تەمووزی هەمان ساڵ داخراوە •

**٥ ـ ڕۆژنامەی ( خەبات )**

ڕۆژنامەیێکی سیاسیی ڕۆژانە بووە بە زمانی کوردیو عـەرەبی

بڵاو کراوەتەوە •

زمانی ئاشکرای پارتی دیموکراتی کوردستان بووە •

شوێنی دەرچوونی / بەغـــدا •

مێژووی ملوەپێدانی / لـــە ١٩٥٩/١/١١ مـــاوەی دەرچوونی دراوەتێ •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ٤/ی نیسانی ساڵی ١٩٥٩ دەرچـــووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی کە ژمارە (٤٦٢) بووە لە ٢٨/ی ئاداری ساڵی ١٩٦١ دەرچووە •

مێژووی داخستنی / لە ١٩٦١/١٠/٢٨ بە ڕەسمی داخراوە •

### ٦ ـ ڕۆژنامەی ( ڕاستی )

ڕۆژنامەیێکی سیاسیی گشتی هەفتانە بووە •

خاوەنی / ئەنوەر مائی •

بەڕێوەبەری ئیدارەی / عەبدولئەحەد ئیبراهیم •

شوێنی دەرچوونی / مووسڵ •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانـــگی نیسانی ســـاڵی ١٩٥٩ دەرچـــووە •

### ٧ ـ ڕۆژنامەی ( ئازادی )

ڕۆژنامەیێکی سیاسیی ڕۆژانە بووە •

زمانی ئاشکرای حیزبی شیوعیی عێراقی ـ لقی کوردستان بووە •

خاوەنی ئیمتیازو لێپرسراوی / پارێزەر نافیع یوونس •

شوێنی دەرچوونی / کەرکووك ـ بەغدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ڕۆژی ١/ی ئاياری ساڵی ١٩٥٩ دەرچـــووە •

لە مانـگی ئابی هەمان ساڵ گوێزراوەتەوە بۆ بەغدا •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی کە ژمارە (٥٦)ی ساڵی دووەمی بووە لە ٢٨/ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٠ دەرچووە •

مێژووی داخستنی / لە ٦/ی ئابی ساڵی ١٩٦١ داخراوە •

**٨ ـ ڕۆژنامەی ( ڕای گەل )**

ڕۆژنامەیێکی سیاسی بووە هەفتەی جارێك بە کوردیو عـەرەبی دەرچـــووە •

خاوەنی / سدیق بلووکینی •

بەڕێوەبەری لێپرسراوی / سدیق عەبدوڵلا •

شوێنی دەرچوونی / کەرکووك •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ٦/ی ئەیلوولی ســـــاڵی ١٩٥٩ دەرچـــووە •

مێژووی داخستنی / لە ساڵی ١٩٦٣ داخراوە •

**٩ ـ گۆڤاری ( نیشتمان )(٣١)**

**١٠ـ گۆڤاری ( ڕزگاری )**

گۆڤارێـکی سیاسیو ئەدەبیو مێژوویی هەفتانە بووە •

خـاوەنی / ساڵح حەیدەری •

سەرۆکی نووسینی / پارێزەر فوئاد جەلال •

شوێنی دەرچوونی / بەغدا •

مێژووی ماوەپێدانی / لە ٦/ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٨ ئیمتیازی دراوەتێ •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٥٩ دەرچووە •

تەنیا (دوو) ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە •

مێژووی داخستنی / لە ٣/ی نیسانی ساڵی ١٩٦٠ داخراوە •

**١١- گۆڤاری ( نەورۆز - مەشخەڵی نەورۆز )**

گۆڤارێکی ئەدەبی‌و زانیاری‌و کۆمەڵایەتی بووە •

خاوەنی / پارێزەر کەمال میرزا کەریم •

شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە نیسانی ساڵی ١٩٥٩ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (٣) بووە کە لە حوزەیرانی هەمان ساڵ دەرچووە • پاشان کراوەتە ڕۆژنامەو بە ناوی ( مەشخەڵی نەورۆز ) هەتا ساڵی ١٩٦٠ بەردەوام بووە •

**١٢- گۆڤاری ( ئافرەت )**

گۆڤارێکی مانگانەی ئافرەتان بووە بە کوردی‌و عەرەبی بڵاو کراوەتەوە •

خاوەنی / ڕابیتەی ئافرەتانی عیراق •

شوێنی دەرچوونی / بەغدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی مایسی ساڵی ١٩٥٩ دەرچووە •

یازدە ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە •

**١٣ـ گۆڤاری ( بڵێسه )(٣٢)**

**١٤ـ گۆڤاری ( هیوای كوردستان )(٣٣)**

**١٥ـ گۆڤاری ( دەنــگی قوتابیان )(٣٤)**

**١٦ـ گۆڤاری ( دەنگی ) قوتابیان )(٣٥)**

**١٧ـ گۆڤاری ( هونەر )(٣٦)**

**١٨ـ گۆڤاری ( گزنگ )(٣٧)**

**١٩ـ ڕۆژنامەی ( برِوا )**

ڕۆژنامەیێكی سیاسی ، كۆمەڵایەتی ، ئەدەبی‌ی هەفتانە بووە •

خاوەن‌و سەرنووسەری / پارێزەر كەمال میرزا كەریم •

شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •

مێژووی ماوەپێدانی/١٤/ی كانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٩ •

مێژووی دەرچوونی / ژمــارە (یەك)ی لە ڕۆژی ٢/ی تەمووزی ســاڵی ١٩٦٠ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (٩٥) بووە كە لە ٢٥/ی كانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦٣ دەرچووە •

مێژووی داخستنی / لە ساڵی ١٩٦٣ داخراوە •

**٢٠ـ ڕۆژنامەی ( دەنــگی كورد )**

ڕۆژنامەیێكی سیاسی بووە هەفتەی جارێك بە كوردی‌و عــەرەبی بڵاو دەكرایەوە •

خاوەنو سەرۆکی نووسینی / پارێزەر عومە جەلال حەویزی •
شوێنی دەرچوونی / بەغـــدا •
مێژووی ماوەپێدانی / لە ١٩٦٠/١/٨ ئیمتیازی دراوەتێ •
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ٩/ی شــــوباتی ســــاڵی ١٩٦٠ دەرچـــووە •
هەتا مایسی ساڵی ١٩٦١ بەردەوام بووە •

**٢١ـ گۆڤاری ( ڕۆژی نوێ )**

گۆڤارێـکی سیاسیو ئەدەبیو کۆمەڵایەتی بووە •
خاوەنی / پارێزەر جەماڵ شاڵی •
سەرنووسەری / کامەران ( کامەران موکری ) •
دەستەی نووسەران / موحەڕەم محەمەد ئەمین ، ئیحســان فوئاد ، عەبدوڵڵا ئەزدەر ، کەریم زەند •
شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •
مێژووی دەرچوونی / زمارە (یەك)ی لە مانـگی ئاداری ســــاڵی ١٩٦٠ دەرچـــووە •
دوا زمارەی / دوا ژمارەی کە ژمارە (١٨) بووە لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٦١ دەرچـــووە •
گۆڤارێـکی دەوڵەمەندو سەرکەوتوو بووە •

**٢٢ـ گۆڤاری ( چارەسەر کردنی کشتوکاڵ )**

گۆڤارێـکی مانـگانە بووە بە عەرەبیو کوردی بڵاو کراوەتەوە •
خاوەنی / وەزارەتی چارەسەرکردنی کشتوکاڵ •
شوێنی دەرچوونی / بەغـــدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی كوردیەكەی لە تەمووزی ساڵی ١٩٦٠ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی كە ژمارە (١٢) بووە لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٢ بڵاوكراوەتەوە •

محەمەدی مەلا كەریم سەرپەرشتیی بەشە كوردیەكەی دەكرد •

**٢٣ـ گۆڤاری ( عیراقی نوێ )**

گۆڤارێكی مانگانەی وێنەدار بووە •

خاوەنی / وەزارەتی ڕابەری •

شوێنی دەرچوونی / بەغدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٦٠ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (٢٤) بووە •

فارووق مستەفا ڕەسووڵو محەمەدی مەلا كەریم سەرپەرشتیی بەشە كوردیەكەیان دەكرد •

**٢٤ـ گۆڤاری ( ژیان )(٣٨)**

**٢٥ـ گۆڤاری ( ئەدیبی عیراقی )**

گۆڤارێكی ئەدەبیو ڕۆشنبیریی گشتی بووە •

خاوەنی / یەكێتی ئەدیبانی عیراقی •

دەستەی نووسەران / پاكیزە ڕەفیق حیلمی ، عەبدولڕەزاق محەمەد ، محەمەد تەوفیق وردی •

شوێنی دەرچوونی / بەغدا •

مێژووی دەرچوونی / یەك ژمـــارەی لێ دەرچووە ئەویش لـــە تەمووزی ساڵی ١٩٦١ بووە •

پاشکۆی گۆڤاری ( الادیب العراقی ) بووە •

٢٦ـ ڕۆژنامەی ( کوردستان )

ڕۆژنامەیێکی سیاسی‌ی ڕۆژانە بووە •

شوێنی دەرچوونی / بەغـــدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ٤/ی ئاداری ساڵی ١٩٦١ دەرچـــووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمـــارە (٥) بووە کە لە ١/ی نیسانی ساڵی ١٩٦١ دەرچووە •

٢٧ـ گۆڤاری ( ڕۆناهی )

گۆڤارێـکی ئەدەبی‌و زانیاری‌و کۆمەڵایەتی بووە •

خاوەنی ئیمتیازو سەرۆکی نووسینی / حافز مستەفا قازی •

شوێنی دەرچوونی / بەغـــدا •

مێژووی مۆڵەپێدانی / لە ١٧/٩/١٩٦٠ مـــاوەی دەرچـــوونی دراوەتێ •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانـگی تشرینی یەکـەمی ساڵی ١٩٦٠ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی لە مانـگی کانوونی یەکـــەمی ســـاڵی ١٩٦٢ دەرچـــووە •

مێژووی داخستنی / لە ساڵی ١٩٦٣ داخراوە •

چ٢ـ ڕۆژنامەی ( هەولێر )

بەخشنامەیێکی هەفتەیی بووە بە کوردیو عەرەبی دەرچووە •
خاوەنی / شارەوانیی هەولێر •
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە سەرەتای سالی ١٩٦٢ دەرچووە •
تا سالی ١٩٦٣ بەردەوام بووە •

دوای ئەوەی ( عەبدولکەریم قاسم ) لە سەرەتاو ئامانجەکانی شۆڕش لایداو کەوتە بەربەرەکانی کردنی هێزە نیشتمانییەکانو کپ کردنەوەی هەموو دەنگو جوولانەوەیێکی شۆڕشگێڕانە ؛ ڕۆژنامەنووسیی کوردیش کەوتەوە بارو دۆخێکی ئالۆزو زۆربەیان داخرانو ئەو گەرمو گوڕییەی سالانی (١٩٥٩ ـ ١٩٦٠)ی نەما •

لە ڕۆژی ٨/ی کانوونی دووەمی سالی (١٩٦٩) دیسان یاسایێکی نوێ بۆ چاپەمەنیەکان دەرچوو ؛ بە پێی ئەم یاسایە هەموو ڕۆژنامەو گۆڤارەکان داخرانو پاشان ماوەی دەرچواندنی هەندێکیان درایەوە(٣٩)•

سەردەمێکی دیکەی گەشە کردنی ڕۆژنامەنووسیی کوردی سەردەمی دوای یازدەی ئاداری سالی (١٩٧٠) یە ، دوای ئەوەی بە شێوەیێکی ڕەسمی دان بە مافەکانی گەلی کوردی کوردستانی عیراق نرا ؛ دەزگا ڕەسمیو هێزە سیاسییەکانو ڕێکخراوە ڕۆشنبیریو پیشەییەکان هەر یەکەیان لە لایەن خۆیەوە کەوتەوە جمو جۆلو کۆتایی سالی (١٩٧٠) هەتا سەرەتای سالی (١٩٧٤) سەردەمێکی هەرە گەشەدارو زێڕینی ڕۆژنامەنووسیی کوردی بوو(٤٠) ؛ لەم ماوەیەدا ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییانە دەرچوون :

**١ ـ گۆڤاری ( بەیان )(٤١)**

**٢ـ ڕۆژنامەی ( هاوکاری )(٤٢)**

**٣ ـ ڕۆژنامەی (ژین)(٤٣)**

ڕۆژنامەیێکی ویژەیی بووە •

خاوەنی ئیمتیازی / کاکەی فەللاح •

سەرەك نووسین / عەبدولقادر بەرزنجەیی •

شوێنی دەرچوونی / سلێمانی

مێژووی دەرچوونی / ژمـــارە (یەك)ی لە ڕۆژی پێنجشەممەی ١٠/ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٠ دەرچووە •

**٤ ـ گۆڤاری ( هەولێر )**

گۆڤارێکی مانگانە بووە بە کوردیو عەرەبی بڵاو دەکرایەوە •

خاوەنی / شارەوانیی هـــەولێر •

بەڕێوەبەری / سەعدی محەمەد ئەمین دزەیی •

سەرەکی نووسین / محەمەد مەولوود (مەم) •

شوێنی دەرچوونی / هـــەولێر •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی مایسی ســـــاڵی ١٩٧٠ دەرچـــووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (یەك)ی ساڵی سێیەمە کـــە لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٢ دەرچووە •

**٥ ـ گۆڤاری ( برایەتی )**

گۆڤارێکی سیاسیی گشتی بووە ، زمـانی ئاشـــکرای پارتی

دیموکراتی کوردستان بوو •

خاوەنی ئیمتیازی / حەبیب محەمەد کەریم •

بەرپرسیاری بەشی کوردی / سەعید ناکـام ، ڕەفیق چـالاك ، ڕەمـزی قـەززاز •

شوێنی دەرچوونی / بەغـدا ـ سلێمانی •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ١/ی حوزەیرانی سـاڵی ١٩٧٠ دەرچـووە •

دوا ژمارەی / ساڵی یەکـەمی (١٣) ژمارەی لێ دەرچـووە ، دواژمارەی ژمارە (یەك)ی ساڵی دووەم بوو کە لە مانـگی نیسانی سـاڵی ١٩٧١ دەرچـووە •

دوو ژمـارەی دوایی لە سلێمانی دەرچووەو خوا لێ خۆشبوو ڕەمزی قەززاز سەرپەرشتیی دەکرد •

## ٦ ـ گۆڤاری ( شۆڕشی کشتوکاڵ )

گۆڤارێـکی هەفتانە بووە بە عەرەبیو کوردی بڵاو دەکرایەوە •

خاوەنی / بەڕێوەبەرایەتی ڕاگەیاندنو بڵاوکردنەوە لـە وەزارەتی چارەسەرکردنی کشتوکاڵ •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانـگی تەموزی ساڵی ١٩٧٠ دەرچـووە •

پێنج ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە •

## ٧ ـ گۆڤاری ( زانیاری )

گۆڤارێـکی زانستیی گشتی بووە •

خاوەنی ئیمتیازی / دەعەزیزئەمینو تەلعەت نادر •

سەرۆکی لێپرسراوی نووسین / د. سامال مەجید فەرەج .
دەستەی نووسەران / د. جوامێر مەجید ، د. دارا ڕەشید جەودەت
د. سەلاح حەفید ، د. تاریق ئامێدی .
شوێنی دەرچوونی / بەغـــدا .
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانـگی تشرینی یەکەمی سـالی ۱۹۷۰ دەرچـووە .
دوا ژمـارەی / دوا ژمارەی ژمارە (٦)ە کە لە مانـگی تشـرینی یەکەمی سالی ۱۹۷۳ دەرچـووە .
تاکە گۆڤاری کوردییە کـە تایبەت بووبێ بە بابەتە زانیارییەکان .

## ٨ ـ گۆڤاری ( چیا )

گۆڤارێـکی ئەدەبی بووە .
سەرۆکی نووسین / بەدرخان سندی .
شـوێنی دەرچوونی / دهۆك .
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانـگی تشرینی دووەمی سـالی ۱۹۷۰ دەرچـــووە .
دوا ژمارەی / دوا ژمارەی کە ژمارە (٢)ی سالی (١) بووە لــــە ١/ی شوباتی سالی ۱۹۷۱ دەرچووە .

## ٩ ـ گۆڤاری ( گێتی پوول )

گۆڤارێـکی زانستیو ئەدەبیو هونەری بووە بە زمـانی کوردیو عەرەبی بلاو دەکرایەوە .
خاوەنی / کۆمەڵەی پوولخوازان .
نووسەری بەشی کوردی / جەودەت خەزنەدار .

شوێنی دەرچوونی / بەغـــدا .
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانـگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٠ دەرچووە .
چـەند ژمارێـکی لێ بڵاو کراوەتەوە .

**١٠ـ گۆڤاری ( خەباتی قوتابیان )(٤٤)**

**١١ـ گۆڤاری ( دەنگی مامۆستا )(٤٥)**

**١٢ـ گۆڤاری ( نووسەری کورد )**

گۆڤارێـکی ئەدەبی بوو .
خاوەنی / یەکێتیی نووسەرانی کورد .
سەر نووسەر / د. مارف خەزنەدار .
سکرتێری نووسین / د. نەسرین فەخری .
دەستەی نووسەران / ئەحمەد غەفوور ، حوسێن عارف ، سـەعید ناکام ، عەبدولڕەززاق بیمار ، محەمەد ئەمین عوسمان .
شوێنی دەرچوونی / بەغـــدا .
مێژووی دەرچوونی / زمارە (یەك)ی لە مانـگی ئاداری ســـاڵی ١٩٧١ دەرچـــووە .
دوا ژمـــارەی / تاکو ســـاڵی ١٩٧٤ یازدە ژمـــارەی لێ بڵاو کراوەتەوە(٤٦) .

**١٣ـ گۆڤاری ( ڕۆژی کوردستان )(٤٧)**

**١٤ـ ڕۆژنامەی ( دەنـگی جوتیار )**

ڕۆژنامەیێکی هەفتانە بوو بە عەرەبی‌و کوردی بڵاو کراوەتەوە .

خاوەنی / یەکێتیی کۆمەڵانی جوتیارانی عیراق •
شوێنی دەرچوونی / بەغـــدا •
مێژووی دەرچوونی / بەشـــە کوردیەکەی لە ژمارە (۱۲۱)ەوە دەستی پێ کردووە کە لە ڕۆژی ۱۰/ی مایسی ساڵی ۱۹۷۱ دەرچووە •

**۱٥ـ پاشکۆی ( برایەتی )**

گۆڤارێـکی سیاسیی گشتی بووە هەفتەی جارێك لـــە شێوەی ڕۆژنامــە دەرچــووە •
شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ڕۆژی هەینیی ڕێکەوتی ۲۳/ی نیسانی ساڵی ۱۹۷۱ دەرچووە •
ڕەمزی قەززاز سەرپەرشتیی دەرچواندنی دەکردو هـــەر لـــە سلێمانی لە چاپخانەی ژین چاپ دەکرا •

**۱٦ـ ڕۆژنامەی ( برایەتی )**

ڕۆژنامەیێکی سیاسی بوو هەفتەی جارێك بڵاو دەکرایەوە •
خاوەنی ئیمتیازی / حەبیب محەمەد کەریم •
سەر نووسەری / دارا تەوفیق •
شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •
مێژووی دەرچوونی / ژمـــارە (یەك)ی لـــە ڕۆژی شـــەممەی ڕێـــکەوتی ۱۱/ی ئەیلوولی ساڵی ۱۹۷۱ دەرچووە •
دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (۱۷) بووە کە لە ۱۸/ی ئاداری ساڵی ۱۹۷۲ دەرچووە •
ڕەمزی قەززاز سەرپەرشتیی دەرکردنی دەکرد •

### ١٧ـ گۆڤاری ( پەروەردەو زانست )

گۆڤارێـکی پەروەردەیی‌و زانستی بوو بە سێ مانگ جارێك بـــە کوردی‌و عـــەرەبی دەردەچوو •

خاوەنی / بەڕێوەبەرێتی‌ی گشتی‌ی خوێندنی کوردی •

شوێنی دەرچوونی / بەغـــدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ساڵی ١٩٧١ دەرچووە •

ژمارە (١٧)ی لە ساڵی ١٩٨٠ دەرچووە •

### ١٨ـ گۆڤاری ( هیڤی )(٤٨)

### ١٩ـ گۆڤاری ( ڕهێلە )(٤٩)

### ٢٠ـ بڵاوکراوەی ( ڕوانـگە )

بڵاوکراوەیێکی ئەدەبی‌ی دەوری بوو کۆمەڵێك ئەدیبی نوێخوازی یاخی بوو دەریان دەکرد •

شوێنی دەرچوونی / بەغـــدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ساڵی ١٩٧١ دەرچووە •

تەنیا (٣) ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە •

### ٢١ـ ڕۆژنامەی ( برایەتی )

ڕۆژنامەیێـــکی سیاسی‌ی ڕۆژانە بووە ، پاشکۆی ڕۆژنامـــەی ( التآخي )(٥٠) بوو ، هەفتەی جارێك بە کوردی دەردەچوو •

خاوەنی ئیمتیازی / حەبیب محەمەد کەریم •

سەرنووسەری / دارا تەوفیق •

شوێنی دەرچوونی / بەغـــدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ٢٦/ی مایسی سالی ١٩٧٢ دەرچووە .

ڕەفیق چالاك سەرپەرشتیی بەشە کوردیەکەی دەکرد .

**٢٢- ڕۆژنامەی ( بیری نوێ )**

ڕۆژنامەیێکی ڕۆشنبیریی گشتی بووە هەفتەی جارێك بلاو دەکرایەوە .

خاوەنی ئیمتیازی / فەخری کەریم زەنگەنە .
سەرنووسەرو لێپرسراوی / دوکتۆر حوسێن قاسم عەزیز .
شوێنی دەرچوونی / بەغدا .

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ڕۆژی ١٧/ی حوزەیرانی سالی ١٩٧٢ دەرچووە .

تا کۆتایی سالی ١٩٧٨ بەردەوام بووە .

پاشکۆی ڕۆژنامەی ( الفکر الجدید )ی عەرەبی بووە .

**٢٣- گۆڤاری ( گزنگ )**

گۆڤارێکی ئەدەبی بووە .
خاوەنی / یەکێتیی نووسەرانی کورد - لقی کەرکووك .
شوێنی دەرچوونی / **کەرکووك** .

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی نیسانی سالی ١٩٧٢ دەرچووە .

ڕەزا شوان سەرپەرشتی دەکرد .

**٢٤ـ گۆڤاری ( نووسەری نوێ )**

کۆمەڵە بەرهەمێکی ئەدەبی بووە •

خاوەنی / یەکێتیی نووسەرانی کورد ـ لقی هەولێر •

دەستەی نووسەران / عیززەددین فەیزی ، حەمە کەریم هەورامی، کەریم شارەزا ، محەمەد حەسەن مەنگوڕی ، عەزیز گەردی ، جـــەمیل ڕەنجبەر ، مەدحەت بێخەو •

شوێنی دەرچوونی / هـــەولێر •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانـگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٢ دەرچـــووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (٥) بووە کە لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٠ دەرچـــووە •

**٢٥ـ گۆڤاری ( بەرەو ڕووناکی )(٥١)**

**٢٦ـ گۆڤاری ( ئەستێرە )(٥٢)**

**٢٧ـ گۆڤاری ( هوشیاری کرێـکاران )**

گۆڤارێـکی هەفتانە بووە بە عەرەبیو کوردی بڵاو دەکرایەوە •

خاوەنی / یەکێتیی گشتی کرێـکارانی عیراق •

شوێنی دەرچوونی / بەغـــدا •

مێژووی دەرچوونی / بەشـــە کوردیەکەی لە ژمارە (١٨٩) وە دەرچووە کە لە ڕۆژی ٧/ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٢ بووە •

**٢٨ـ گۆڤاری ( بیری نوێ )(٥٣)**

**٢٩ـ گۆڤاری ( کۆلیجی ئەدەبیات )(٥٤)**

٣٠- گۆڤاری ( بۆ پێشەوە )(٥٥)

٣١- گۆڤاری ( ڕۆشنبیر )

گۆڤارێکی ڕۆشنبیری بووە .

خاوەنی / کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کوردی - لقی هەولێر .

سەرۆکی نووسین / عەبدولڕەززاق بێتووشی .

سکرتێری نووسین / ئەحمەد شەریف .

دەستەی نووسەران / مومتاز حەیدەری ، حازم باجەلان ، سامیە شاکر ، عەبدولقادر محەمەد ئەمین .

شوێنی دەرچوونی / هەولێر .

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی نیسانی ی ١٩٧٣ دەرچووە .

٣٢- گۆڤاری ( ڕۆشنبیری نوێ )(٥٦)

٣٣- گۆڤاری ( کۆڕی زانیاری کورد )(٥٧)

٣٤- گۆڤاری ( ئامانج )(٥٨)

٣٥- ڕۆژنامەی ( برایەتی )

ڕۆژنامەیێکی سیاسیی ڕۆژانە بووە .

خاوەنی ئیمتیازی / حەبیب محەمەد کەریم .

سەرنووسەری / دارا تەوفیق .

شوێنی دەرچوونی / بەغدا .

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (سفر)ی لە ڕۆژی سێشەممەی ڕێکەوتی ١/ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٤ دەرچووە .

ژمارەی (٢٥)ی لە ڕۆژی چوارشەممەی ٦/ی شوباتی هەمان ساڵ دەرچووە .

سەبارەت بە ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی لە ئێراندا تاکە ماوەی گەشەکردنی کە بە خۆیەوەی دیبێ سەردەمی **کۆماری (مەهاباد)** . ، لەم ماوە کورتەدا دەزگاکانی دیموکرات توانیان بەو پەڕی چالاکیەوە ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردیانە دەربچوێنن :

**١ ـ گۆڤاری ( کوردستان )**

گۆڤارێکی سیاسی‌و ئەدەبی‌و کۆمەڵایەتی‌ی نیو مانگی بووە .
خاوەنی / حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران .
شوێنی دەرچوونی / مەهاباد .
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ٦/ی کانوونی یەکەمی ساڵی **١٩٤٥** دەرچووە .
دوا ژمارەی / دوا ژمارەی لە کۆتایی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی **١٩٤٦** دەرچووە .

**٢ ـ گۆڤاری ( هاواری کورد )**

گۆڤارێکی سیاسی مانگانە بووە .
شوێنی دەرچوونی / مەهاباد .
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی **١٩٤٥** دەرچووە .

**٣ ـ گۆڤاری ( ئاوات )**

گۆڤارێکی وێژەیی‌و زانستی‌و کۆمەڵایەتی بووە .

شوێنی دەرچوونی / مەهـــاباد •
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ساڵی ١٩٤٥ دەرچووە •
سێ ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە •
محەمەد ئازاد سەرپەرشتیی دەرکردنی کردووە •

**٤ ـ ڕۆژنامەی ( کوردستان )**

ڕۆژنامەیێکی سیاسیی ڕۆژانە بووە ، زمـانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بووە •

شوێنی دەرچوونی / مەهاباد •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ١١/ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦ دەرچووە •

بە هۆی ڕووخاندنی کۆماری مەهاباد ئەویش پەکی کەوتووە(٥٩)•

**٥ ـ گۆڤاری ( هەڵاڵە )**

گۆڤارێـکی سیاسیو ئەدەبی بووە •
خاوەنی / لاوانی دیموکراتی کوردستانی ئێران •
سەرۆکی نووسینی / حەسەن قزلجی •
شوێنی دەرچوونی / بۆکان

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ڕۆژی نەورۆزی ســاڵی ١٩٤٦ بڵاو کراوەتەوە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی کە ژمارە (٣)یە لە مانگی حوزەیرانی هەمان ساڵ دەرچووە •

### ٦ ـ گۆڤاری ( هاواری نیشتمان )

گۆڤارێکی سیاسیو ئەدەبیو کۆمەڵایەتی بووە •

خاوەنی / لاوانی دیموکراتی کوردستانی ئێران •

بەڕێوەبەری لێپرسراوی / سدیق ئەنجیری ئازەر •

شوێنی دەرچوونی / مەهاباد •

مێژووی دەرچوونی / تەنیـــا (یەك) ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە ئەویش لە ڕۆژی نەورۆزی ساڵی ١٩٤٦ بووە(٦٠) •

### ٧ ـ گۆڤاری ( گزوگاڵی منداڵانی کورد )(٦١)

دوای ڕووخاندنی کۆمـــارە ساواکەی مەهـــابادو لەناو بردنی سەرکردەکانی بیرۆی شای گۆڕکراو بۆ ماوەیێك لە تاران ڕۆژنامەیێکی بەناوی (کوردستان) دەرکردو ئەم ڕۆژنامەیەش زۆری نەخایاندو ئیدی لـەم ماوەیەداو هەتا ئێستاش لە سەرتاپای ئێران نەمانزانیوە لە ڕۆژنامەی نهێنی بەم لاوە هیچ ڕۆژنامەیێکی کوردیی یاسـایيو سەرکـــەوتوو دەرچـــووبێ(٦٢) •

دەربارەی ڕۆژنامەنووسیی کوردی لە (تورکیا)شدا هەر لە ساڵی (١٩١٩) وە تاکو ئێستا هیچ ڕۆژنامەیێکی یاسایی دەرنەچووە ، جـــگە لەمەش فەرمانڕەواکانی تورکیا کوردی ئەوێیان لە هەموو مافێکی سیاسیو ڕۆشنبیری بێ بەش کردووەو سنووری تورکیاشیان لە سەر چاپەمەنییە کوردییەکان داخستووە(٦٣) •

دوکتۆر کەمـــال مەزهەر ئەحمەد لە کتێبی ( تێگەیشتنی ڕاستیو شـــوێنی لـــە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا ) دەربارەی باری شپرزەیی ڕۆژنامەنووسیی کوردی لە تورکیادا دەڵێ : ( لە شەستەکاندا لـە تورکیا

ڕێـگەی دەرچوونی (٩٤٢) ڕۆژنامەو (٧١٦) گۆفار درا لەمانە (٧٢) یان بە زمـانی بێـگانەو کەمینەکانی ناو وولات بوو بە فەڕەنسی ٢٦ ، بــە ئینگلیزی ١٠ ، بە ئەڵەمانی ٦ ، بە ئیتالی ٢ ، بە ئەرمەنی ١٥ ، بــە یۆنانی ٨ ، بە عیبری ٣ ، بە ئەلبانی ١ و بە کوردیش ٠٠٠ سفر )(٦٤) .

چۆنیەتی سەربەستیی ڕۆژنامەنووسی‌و چاپەمەنیە کوردیەکان لە (سوریا)شدا لە هی تورکیــا باشتر نیــە ، لێرەدا تەنیا ئەو نووسینەی ( دوکتۆر عیززەددین مستەفا ڕەسوول ) دەخەینەوە بەر چاو کــە دەڵێ : ( خوێندکارێـکی زانکۆییان لـە سووریا گرت‌و بەندیان کرد‌و کــەس دوا ڕۆژی نەزانی لە سەر ئەوەی تەنیا کتێبێکی ئەلف‌و بێی کوردی لێ گیرا ! )(٦٥) .

ســەبارەت بــە چاپەمەنیە کوردیەکانی یەکێتیی سۆفیەتیش هەرچەندە ڕۆژنامەی ( ڕێیا تازە )و جار بە جار کتێبی کوردیش دەردەچێ بەڵام لەبەر دووری شوێن‌و جیاوازی زاری زمان‌و بەکار هێنــانی پیتی ڕووسی (سلافی) ، بەشەکانی دیــکەی کوردستان ناتوانن بــە تەواوی سوودیان لێ وەربگرن(٦٦) .

لە کۆتایی ئەم باسەدا ڕاستیەك هەیە دەبێ هــەموو لایەکمــان بسەلمێنین ئەویش ئەوەیە کە هەر لە دەرچوونی یەکەمین ڕۆژنامــەی کوردی لە عیراقداو تاکو ئێستاش ـ سەردەمی کۆماری مەهــابادی لێ دەربچێ ـ هەمیشە پێشەنـگی کاروانی ڕۆژنامە نووسیی کوردی هــەر لە عیراق بووە‌و نزیکەی ٧٥٪ی هەموو ڕۆژنامەو گۆفارە کوردیەکان لە عیراق‌و بە تەنیا لە شاری بەغداش نزیکەی ٣٥٪ی دەرچووە .

. . . . . . . .

---

(١) د. سنان سعيد / دراسات في الصحافة العراقية / لاپەڕە : ٩
(٢) هـــەمان سەرچاوە .
(٣) هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٨ و ٩
(٤) هـــەمان سەرچاوە لاپەڕە ١٠
(٥) هەمان سەرچاوە لاپەڕە ١٠
(٦) هەمان سەرچاوە لاپەڕە ١١
(٧) فائق بطي / صحافة الاحزاب وتاريخ الحركة الوطنية لاپەڕە ١٨٩
(٨) هەمان سەرچاوە لاپەڕە ١٨٩
(٩) بڕوانە : جەمال خەزنەدار / بانگی کوردستان / بەغدا ١٩٧٤
(١٠) بڕوانە : جەمال خەزنەدار / ڕۆژی کوردستان / بەغدا ١٩٧٣
(١١) بڕوانە : د. کەمال مەزهـــەر ئەحمەد / تێگەیشتنی ڕاستی / لاپەڕە : ٢٢٠
(١٢) فائق بطي / صحافة الاحزاب / لاپەڕە ١٩٠
(١٣) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە
(١٤) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە
(١٥) قيس عبدالحسين الياسري / الصحافة العراقيـــة والحركـــة الوطنية / لاپەڕە ٧١
(١٦) فائق بطي / هەمان سەرچاوە لاپەڕە ١٩١
(١٧) قيس عبدالحسين الياسري / هەمان سەرچاوە / لاپەڕە ٧١
(١٨) سەرچاوەی پێشوو / لاپەڕە ٧٢
(١٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو / لاپەڕە ٧١
(٢٠) هەمان سەرچاوە / لاپەڕە ١٠٦
(٢١) وتارەکە بـــە عەرەبی بە ناونیشانی ( التتريك لا يزيد الشعب الـــكردي الا تمسكا بقوميته وثورتـــه على المستعمر ) بوو . ( بڕوانە : قيس الياسري / الصحافة العراقية والحركة الوطنية / لاپەڕە : ١٠٢ ) .
(٢٢) ناوبراو بە پێی بڕبڕە (٢)ی ماددەی ( ٢٥ )ی بەش چـوارەمی یاسای چاپەمەنییەکانی ئەو کاتی حوکم درا کە دەڵێ : ( ئەگـــەر یەکێك ئیهانەی یەکێك لە ئەندامانی خێزانی پاشایەتی ، یاخـود ئەو پاشایانەی کە پێوەندییان لەگەڵ دەوڵەتی عیراقدا باشـــە ،

• • • • • • • •

---

یاخود سەرۆکی وەزیران بکات ، سزای ئەو کەسە بەندی کردنە بە شەرتێك لە سالێك تێنەپەڕێ‌و بە پێ بژاردنیش کە لـە (٧٥) دینار پتر نەبێت ) ٠

(بڕوانە : فائق بطي / صحافة الاحزاب / لاپەڕە : ١٩٧ )

(٢٣) قیس عبدالحسین الیاسري / هەمان سەرچاوە / لاپەڕە : ٦٩

(٢٤) هەمان سەرچاوە / لاپەڕە ٦٩

(٢٥) فائق بطي / صحافة الاحزاب / لاپەڕە ٤٤

(٢٦) یعقوب یوسف کوریا /حکایات عن الصحافة في العراق/ لاپەڕە ٣٩

(٢٧) ، (٢٨) ، (٢٩) هەر چەندە ئەم سێ گۆڤارانە بە ماوەیێك پێش شۆڕش ١٤/ی تەمووز دەرچوونیە، بەلام لەبەر ئەوەی بە درێژایی قۆناخەکە هەر بەردەوام بووینە ، لەگەل ڕۆژنامەنووسی ئـــەم سەردەمیمان ژمـاردن ٠

(٣٠) ئەم ڕۆژنامەی ( برایەتی ) یە لە هیچ سەرچاوەیێکی کوردیدا نیە، بەلام لە سەرچاوە عەرەبییەکانی وەکو ( کشاف الجرائد والمجلات العراقیة ) و ( دلیل الصحافة العراقیة ) دا هەنە ، لەوە دەچێ کاتی خۆی ئیمتیازی ئەم ڕۆژنامەیە وەرگیرابێ بەلام دەرنەچــووبێ ، هەرچەندە خاوەنی کتێبی ( کشاف الجرائد والمجلات العراقیـة ) دەلێ کە لە وەزارەتی ڕاگەیاندن هەیەو هۆی داخستنیش گوایـە لەبەر ئەوە بووە کە بارمتەی یاسایی نەدراوە ٠ دەربارەی بڕوانە:

١ ـ زاهدە ابراهیم / کشاف الجرائد والمجــلات العراقیة / لاپەڕە : ١٤

٢ ـ وزارة الاعلام/دلیل الصحافة العراقیة/ لاپەڕە : ٧ و ٨

(٣١) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسیی قوتابخانەکان/ زنجیرە : ١

(٣٢) دەربارەی گۆڤاری بلێسە بڕوانە : ڕۆژنامەنووسیی مامۆستایان/ زنجیـــرە : ٢

(٣٣) دەربارەی گۆڤاری هیوای کوردستان بڕوانە : ڕۆژنامەنووسیی قوتابیان / زنجیرە : ٤

(٣٤) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسیی قوتابیان /زنجیرە : ١

(٣٥) بڕوانە ڕۆژنامەنووسیی قوتابیان زنجیرە/٣

• • • • • • • •

---

(٣٦) دەربارەی گۆڤاری هونەر بڕوانە : ڕۆژنامەنووسیی قوتابخانەکان زنجیرە : ٢

(٣٧) دەربارەی گۆڤاری (گزنگ) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسیی قوتابیان/ زنجیرە : ٥

(٣٨) دەربارەی گۆڤاری ژیان بڕوانە : ڕۆژنامەنووسیی قوتابیان/ زنجیرە : ٦

(٣٩) بڕوانە : دليل الصحافة العراقية / لاپەڕە : ٧٠

(٤٠) ئەوەی شایانی باسە دوکتۆر عیزەددین مستەفا ڕەسوول ئەم قۆناغەی دوای ١١/ی ئاداری بە درێژە پێدانی قۆناغی ١٤/ی تەمووزی ١٩٥٨ دناوە ، بەڵام بە باوەڕی ئێمە قۆناغێکی سەربەخۆیەو لە هەموو قۆناغەکانی دیکەش پتر جێی دیارە ٠ ( بڕوانە : د٠ عیزەددین مستەفا / حول الصحافة الكردية / لاپەڕە : ١٠ )

(٤١) و (٤٢) و (٤٣) هەرچەندە ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارانەش بە ماوەیێکی کەم پێش ١١/ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ دەرچووینە ، بەڵام دوای ئەم مێژووە پتر گەشەیان کردووەو بە درێژایی ماوەی ئەم قۆناغەش هەر بەردەوام بوونە ، لەبەر ئەوە لەگەڵ ڕۆژنامەنووسیی ئەم سەردەمەمان دانان ٠
– دەربارەی بەیانو هاوکاری بڕوانە : ڕۆژنامەی بە تەمەن زنجیرە : ٦ و ٧ ٠

(٤٤) دەربارەی گۆڤاری خەباتی قوتابیان بڕوانە : ڕۆژنامەنووسیی قوتابیان / زنجیرە : ٨

(٤٥) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسیی مامۆستایان/زنجیرە : ٣

(٤٦) خولی یەکەمی گۆڤاری ( نووسەری کورد ) تاکو ساڵی ١٩٧٤ بەردەوام بوو و (١١) ژمارەی لێ بڵاو کرایەوەو پاشان ژمارە دوانزەش بە شێوەیێکی نایاسایی دەرچوو ، پاشان وەستا ٠ خولی دووەمیش دوازدە ژمارەی لێ بڵاو کرایەوەو ئەویش پەکی کەوت٠
دوای یەکبوونی یەکێتیی نووسەرانی کورد لەگەڵ یەکێتیی ئەدیبانو نووسەرانی عیراقی خولی سێیەمیش دەستی بە دەرچوون

کرد ، تا ئامادە کردنی ئەم باسە شەش ژمـــارە لەم خولەش بڵاو کراوەتەوە ٠

(٤٧) دەربارەی گۆڤاری ( ڕۆژی کوردستان ) بڕوانە ڕۆژنامەی بـــە تەمـــەن / زنجیرە : ٨

(٤٨) دەربارەی گۆڤاری هیڤی بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی مامۆستایان / زنجیـرە : ٤

(٤٩) دەربارەی گۆڤاری ڕەهێڵە بڕوانە :ڕۆژنامەنووسی‌ی قوتابخانەکان / زنجیـــرە : ٧

(٥٠) ( التآخي ) ڕۆژنامەیێکی عەرەبی‌ی ڕۆژانە بوو ، زمانی ئاشـکرای پارتی دیموکراتی کوردستان بوو ، لە بەغدا دەردەچوو ، ژمـــارە (یەك)ی لە ٢٩/ی نیسانی سالی ١٩٦٧ دەرچووەو لە ١١/ی تشرینی دووەمی سالی ١٩٦٨ داخراوە ، پاشان لـــە ٤/ی مایس سالی ١٩٧٠ جارێـکی کە ماوەی دەرچوونی دراوەتێو تا ئاداری ســالی ١٩٧٤ بەردەوام بووە ، دوا ژمارەی ژمارە (١٥٨٥) بوو کـە لـە ڕۆژی سێشەممەی ١٢/ی ئاداری سالی ١٩٧٤ دەرچووە ، پاش ئەم مێژووەش بە ماوەیێکی کەم جارێــکی دیکەش دەرچۆتەوەو نزیکەی دوو سال بەردەوام بووە ٠

(٥١) دەربارەی گۆڤـــاری بەرەو ڕووناکی بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی قوتابخانەکان / زنجیرە : ١٠

(٥٢) دەربارەی گۆڤاری ئەستێرە بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی منداڵان / زنجیـرە : ٢

(٥٣) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی قوتابخانەکان / زنجیرە : ٨

(٥٤) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی قوتابخانەکان / زنجیرە : ٩

(٥٥) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی مامۆستایان / زنجیرە : ٥

(٥٦) بڕوانە : ڕۆژنامەی بە تەمەن / زنجیرە : ١٠

(٥٧) بڕوانە : ڕۆژنامەی بە تەمەن / زنجیرە : ٩

(٥٨) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی مامۆستایان / زنجیرە : ٦

(٥٩) دوای ڕووخاندنی کۆماری مەهابادو لە سالی ١٩٦٠ جارێـــکی دیکەش ڕۆژنامەی کوردستان لە ئێران بە نهێنی بڵاوکراوەتەوە ، پاشان (٢٦) ژمارەیشی لە ئەوروپا بڵاو کراوەتەوە ٠ لـــە سالی ١٩٧١ دیسان دەرچۆتەوەو ماوەیێك بەردەوام بووە ٠

(٦٠) دەرچوونی گۆڤاری هەڵاڵە لە بۆکانو هاواری نیشتمان لە مەهاباد لەلایەن لاوانی دیموکراتی کوردستانو لەم دوو شوێنەدارو لــــە یەك ڕۆژ لەوە دەچێ هەر ڕێکەوت نەبێ ، بەڵکو سەرکردایەتی ئەم ڕێکخراوە بڕیاری لەســـــەر دابێت ، دیارە ڕۆژی نەورۆزیش باشترین بۆنە بووە بۆ جێ بەجێ کردنی بڕیارەکەو دەرچوونی هــــەردوو گۆڤارەکە ٠

(٦١) دەربارەی گۆڤـــاری گروگاڵی منـــداڵانی کورد بڕوانە : ڕۆژنامەنووسیی منداڵان / زنجیرە : ١

(٦٢) بڕوانە : جـــەبار جەباری / مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی / لاپەڕە : ١٣٩ ، ١٤٠

(٦٣) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو / لاپەڕە : ١٨٢

(٦٤) د٠ کەمال مەزهەر ئەحمەد / تێگەیشتنی ڕاستی / لاپەڕە : ٩٢

(٦٥) د٠ عزالدین مصطفی رسول / حول الصحافة الکردیة / لاپەڕە:١٧

(٦٦) هەمان سەرچاوە / لاپەڕە : ١٧

# ڕۆژنامەی بەتەمەن

باری تایبەتیو ئاڵۆزی کوردستانو تەنسگ بێ هەڵچینی زۆربەی بیرۆیەکان بۆ زمانو ڕۆشنبیریی کوردیو نەبوونی سەربەستیی ڕۆژنامەنووسیو کزیو گرانیو بێ بازاڕی چاپەمەنیی کوردیو . . . و ... دەیان هۆی دی بوونەتە کۆسپو نەیان هێشتووە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان هەندە بەردەوام بنو بتوانین بێ سڵەمینەوە بڵێین ئێمەش ڕۆژنامەی بە تەمەنمان هەیە ، بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو کۆسپو تەگەرانەشدا ڕۆشنبیری دڵسۆزو لێهاتووی وامان تێدا هەڵکەوتووە کە ویستو ئارەزوو و متمانە کردنیان بە خۆو پشت بەستنیان بە نەتەوەکەیان زۆر لەم کۆسپو تەگەرانە بەهێز تر بووەو جاری وا هەبووە لە سایەی دڵسۆزیو پشوو درێژی ئەوانەوە توانیویانە هەندێك درێژە بە تەمەنی چاپەمەنیەکانیان بدەنو بۆ ماوەیێکی تا ڕادەیێك درێژیش بەردەوام بن . لێرەدا لەبەر ئەو هۆیانەی لە سەرەوە باسمان کردن ؛ ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەی کە لە (١٠) ساڵو زیاتر بەردەوام بوونە بە ڕۆژنامەی تەمەن درێژیان دادەنێین :

١ ـ ڕۆژنامەی ( ژیان )

ڕۆژنامەیێکی سیاسیو ئەدەبیو کۆمەڵایەتیی هەفتانە بووە •

خاوەنی / حوسێن نازمو پاشان پیرەمێردی نەمر •

شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لـــە ٢١/ی کـــانوونی دووەی ساڵی ١٩٢٦ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (٥٥٣) بووە کە لە ١٠/ی ئاداری ساڵی ١٩٣٨ دەرچـــووە •

ڕۆژنامەیێکی دەوڵەمەند بووەو هەمیشە کەڵە شاعیرو نووســـەرە ناودارەکان بەرهەمیان تێدا بڵاو کردۆتەوە •

٢ ـ ڕۆژنامەی ( ڕێیا تازە )

ڕۆژنامەیێکی سیاسیو هەفتانەیە •

خاوەنی / حیزبی شیوعی ئەرمەنستانی سۆڤیەتی •

بەرپرسیاری / پارێزەر میرۆ ئەسەد •

شوێنی دەرچوونی / یەریڤان •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ٢٥/ی ئاداری ســـاڵی ١٩٣٠ بە زاری کرمانجیی ژووروو و بە پیتی لاتینی دەرچووە •

لە ساڵی ١٩٣٨ پەکی کەوتووە •

جارێـکی دی لە ساڵی ١٩٥٥ دەرچۆتەوە بەڵام ئەمجارەیان بـــە پیتی ڕووسی •

زۆربەی نووسەرە کوردەکانی سۆڤیەتی بەرهەمی تێـــدا بڵاو دەکـــەنەوە •

ئەم ڕۆژنامەیە تا ئیستا بە تەمەنترین ڕۆژنامەی کوردییە •

### ٣ ـ گۆڤاری ( هاوار )

گۆڤارێکی کۆمەلأیەتیو ئەدەبیو سیاسی بووە •

خاوەنو بەرپرسیاری / جەلادەت عالی بەدرخان •

شوێنی دەرچوونی / دیمەشق ( شام ) •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ١٥/ی مایسی سالی ١٩٣٢ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (٥٧) بووە کە لە ١٥/ی ئابی سالی ١٩٤٣ دەرچووە •

گۆڤارێکی دەولەمەندو سەرکەوتوو بووە ، هەمیشە سنووری دەشکاندو زۆربەی ژمارەکانی دەگەیشتە دەست خوێنەرانی بەشەکانی دیکەی کوردستان •

نووسەرە کوردەکانی عیراقیش بەرهەمیان تێدا بلأو دەکردەوە • لەسەرەتاوە بە پیتی هیجاو لاتینیو پاشانیش تەنیا بە پیتی لاتینی دەردەچوو •

### ٤ ـ رۆژنامەی ( ژین )

رۆژنامەیێکی ئەدەبیو کۆمەلأیەتیی هەفتانە بووە •

خاوەنو بەرپرسیاری / پیرەمێردی نەمرو دوای کۆچی دوایی پیرەمێرد جەمیل سائیبو دوای ئەم نووری ئەمین مەحموودو لەپاشان گۆرانی نەمرو پاشانیش ئەحمەد زرنگ هەر یەکەیان بۆ ماوەیێك بەرپرسیاری رۆژنامەکە بوون •

شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی کە ژمارە (٥٥٤) لە سەر داندراوەو بە تەواوکەری ڕۆژنامەی ژیان داندراوە لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٩ دەرچووە •

مێژووی داخستنی / لە ساڵی ١٩٦٣ داخراوە •

تا ئێستا بەتەمەنترین ڕۆژنامەی کوردی عیراقیە •

**٥ - گۆڤاری ( گەلاوێژ )**

گۆڤارێکی ئەدەبیو ڕۆشنبیری‌ی مانگی کوردی بووە •

خاوەنی ئیمتیازی / پارێزەر ئیبراهیم ئەحمەد •

بەڕێوەبەری ئیدارەی / عەلائەددین سەجادی •

شوێنی دەرچوونی / بەغدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٩ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی کە ژمارە (١٠٥) بوو لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٤٩ دەرچووە •

ئەو گۆڤارە هەرچەندە چەند مانگێك لە (١٠) ساڵ کەمتر بەردەوام بووە ، بەڵام یەکێکە لە گۆڤارە هەرە سەرکەوتووەکانی کوردیو قوتابخانەیێك بووە نەوەیێکی نوێی پەروەردە کردووەو نووسەرە هەرە بەرزەکان هاوبەشیان تێدا کردووەو هەمیشە بەرهەمیان تێدا بڵاو کردۆتەوە •

مامۆستای خوالێخۆشبوو عەلائەددین سەجادی‌ی سەرنووسەری گەلاوێژ دەربارەی ئەم گۆڤارە دەڵێ : ئەم گۆڤارە چاکتر گۆڤاری ئەدەبیو عیلمی کورد بووە[1] •

دوکتۆر کەمال مەزهەریش هەر دەربارەی گۆڤاری گەلاوێژ دەڵێ : یەکێکە لە گۆڤارە هەرە بەرزەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی سەردەمی خۆی(٢) •

هەروەها مامۆستا جەبار جەباریش دەڵێ : گەلاوێژ بەرزترین گۆڤاری زانیاریو کۆمەڵایەتیو ئەدەبی کورد بوو لە هەموو مێژووی نەتەوەی کوردا(٣) •

٦ ـ **گۆڤاری ( بەیان )**

گۆڤارێکی ئەدەبیو هونەری مانگانەی گشتییە •

خاوەنی / وەزارەتی ڕاگەیاندنی عیراقیو پاشانیش دەزگای ڕۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی •

بەرپرسیاری/لە سەرەتاوە دوکتۆر ئەکرەم فازیل بەرپرسیاری بووە

سکرتێری نووسینی / جەلال کەریم / تا پێنج ژمارەی •

لەوەو دوا مستەفا نەریمان تا ٢٥ ژمارە •

شوێنی دەرچوونی / بەغدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٩ دەرچووە •

هەتا ئێستاش هەر بەردەوامە وەکو گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبیو دەستەی نووسەرانی ئێستای بریتییە لە :

سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێڕو سەرنووسەر / موسلیح جەلالی سکرتێری نووسین / ئازاد شوان •

دەستەی نووسەران / د• ئیحسان فوئاد ، د• کاوس قەفتان ،

د• عیزەددین مستەفا ڕەسوول ، مەحموود زامدار ، مستەفا نەریمان ، عەبدولڕەززاق بیمار ، محەمەد مستەفا حەمە بۆر ، عەبدولکەریم فنـــدی دۆسکی ، حوسێن ئەحمەد جاف ، سەبری ئەحمەد بۆتانی •

دوا ژمارەی کە تا ئێستا دەرچووبێ ژمارە (١٤١)ە کە لـە ئاداری ســاڵی ١٩٨٨ دەرچـــووە •

ئـــەم گۆڤـــارە بەتەمەنترین گۆڤاری کوردییە لـــــە مێژووی ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردیدا •

**٧ ـ ڕۆژنامەی ( هاوکـاری )**

ڕۆژنامەیێکی هەفتانەی گشتی‌یە ، ئێستا هەفتەی دوو جار دەردەچێ

خاوەنی / دار الجماهیر ، پاشان دار التضامن ، لەدوایشدا دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی •

شوێنی دەرچوونی / بەغدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ڕۆژی هەینی ٩/ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٠ دەرچـــووە •

هـــەتا ئێستاش هەر بەردەوامەو دوا ژمارەی کە تا ئێستا دەرچووبێ ژمارە (٩٦٦)ە کە لە ڕۆژی پێنج‌شەممەی ١٤/ی نیسانی ســـاڵی ١٩٨٨ دەرچــــووە •

**٨ ـ گۆڤاری ( ڕۆژی کوردستان )**

گۆڤارێـــکی ڕۆشنبیری‌ی گشتی‌یە •

خاوەنی / کۆمەڵەی ڕۆشنبیری‌ی کوردی •

سەرۆکی نووسین / ساڵح یووسفی ، پاشان دوکتۆر مەکـــەڕەم

تاڵەبانیو دوایش هاشم حەسەن عەقراویو ئینجا عەبدولسەتتار تاهیر شەریفو دیسان هاشم ئاکرەیی •

سکرتێری نووسین / سەعید ناکام ، ئینجا جەمال خەزنەدارو پاشان موسلیح جەلالی ، لەدوایدا عەبدوللا عەبباسو ئینجا محەمەد سالح عەبدولکەریم •

بگێڕی کاروبار / جەمال خەزنەدار •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧١ دەرچووە •

هەتا ئێستاش هەر بەردەوامە •

**٩ ـ گۆڤاری ( کۆڕی زانیاری کورد ـ کۆڕی زانیاری عیراق )**

گۆڤارێکی خولیە بە زمانی کوردیو عەرەبی دەردەچێ •
خاوەنی / کۆڕی زانیاری کورد ، پاشانیش کۆڕی زانیاری عیراق •
سەرۆکی نووسین / ئیحسان شێرزاد تا ساڵی ١٩٧٤
سکرتێری نووسین / د• کەمال مەزهەر ئەحمەد تا ساڵی ١٩٧٤
شوێنی دەرچوونی / بەغدا •
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە نیوەی یەکەمی ساڵی ١٩٧٣ دەرچووە •

ئێستاش کۆڕی زانیاری عیراقی / دەستەی کورد دەری دەکات •

گۆڤارێکی دەوڵەمەندەو بە قەبارەش گەورەترین گۆڤاری کوردییە •

**١٠- گۆڤاری ( ڕۆشنبیری نوێ )**

گۆڤارێکی ئەدەبیو ڕۆشنبیری‌یە •

خاوەنی / بەڕێوەبەرێتی‌ی گشتی خوێندنی کوردی ، پاشـانیش دەزگای ڕۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی •

سەرۆکی نووسین / د• ئیحسان فوئاد / تا ساڵی ١٩٧٦
سکرتێری نووسین / حوسێن عارف •
شوێنی دەرچوونی / بەغـدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (سفر)ی لە ١١/ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٣ دەرچـووە •

هەتا ئێستاش بەردەوامە وەکو گۆڤارێکی وەرزانەی لێکۆڵینەوەو بە قەبارەیێکی گـەورە دەردەچێ‌و دوا ژمـارەی کـە تا ئێستە دەرچووبێ ژمـارە (١١٦) یە •

دەستەی نووسەرانی ئێستای پێکهاتووە لە :

سەرۆکی ئەنجوومەنی کارگێڕو سەرنووسەر / موسلیح جـەلالی
سکرتێری نووسین / عەبدولڕەززاق بیمار •

دەستەی نووسەران / د• ئەمین موتابچی ، د• جەمـال ڕەشید ، د• موحسین محەمەد حوسێن ، د• کوردستان موکریانی ، فوئاد حەمـە خورشید ، غەفوور میرزا کەریم •

**١١- گۆڤاری ( ئۆتۆنۆمی )**

گۆڤارێکی کوردی‌و عەرەبیە •

خاوەنی / ئەنجوومەنی یاسا دانانی ناوچەی کوردستان •

سەرنووسەری / بەکر مەحموود ڕەسووڵ ، پاشان محەمەد عەلی ئەمین لە دوایشدا ئەحمەد عەبدولقادر نەقشبەندی •

سکرتێری نووسین / محەمەد سەعید عەبدولڕەحمان •

شوێنی دەرچوونی / هەولێر •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٥ دەرچووە •

هەتا ئێستاش بەردەوامەو دوا ژمارەی کە تا ئێستا دەرچووبێ ژمارە (٥٨)ی ساڵی (١٩٨٨)ە •

---

(١) عەلائەددین سەجادی / مێژووی ئەدەبی کوردی / لاپەڕە : ٥٥٦

(٢) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد/ تێگەیشتنی ڕاستی/لاپەڕە : ٢٣٦

(٣) عەبدولجەبار محەمەد جەباری / مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی / لاپەڕە : ٩٢

# ڕۆژنامەی تەمەن کورت

ئەگەر سەرنج بدەینە مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوردی دەبینین زۆر جار ڕۆژنامەیێك یاخود گۆڤارێك دەرچووەو زۆری پێ نەچووەو لەبەر چاوان ون بووە ، بەڵکو زۆر جار دوای دەرچوونی یەك ژمارەی یان چەند ژمارەیێکی کەمی پەکی کەوتووە ، ئەمەش بۆ چەند هۆیێکی سەرەکی دەگەڕێتەوە ؛ گرنگەکانیان ئەمانەن :

١ ـ هەڵوێستی نەگۆڕاوی ڕۆژنامەکە بەرانبەر بە بیرۆی سیاسی‌ی ئەو دەوڵەتەی کە تێیدا دەرچووە ٠

٢ ـ گوێزرانەوەی کاری ڕەسمی‌ی خاوەنەکەی بۆ شوێنێکی دیکە ٠

٣ ـ کۆڵدان‌و پشوو تەنگی خاوەنەکەی ، چونکە ڕۆژنامەنووسی پێویستی بە شەونخوونی‌و هەوڵدان‌و ماندوو بوونێکی زۆر هەیە ، هەر لەبەر ئەمەشە کە ڕۆژنامەنووسیان بە سەربازێکی نەناسراو داناوە ٠

٤ - زۆر جار خاوەنی ڕۆژنامەکە چاپەمەنیەکەی لە بارو دۆخێکی تایبەتی دەرکردووەو بە نەمانی ئەو بارو دۆخە ئەمیش نەماوە •

٥ - گرانیی چاپەمەنیو دەرچوونو کزیی بازاڕی چاپەمەنیی کوردی •

ئەوەی شایانی باسە زۆربەی گۆڤارەکانی قوتابخانە لەم بابەتەن •

ئەمەش چەند ڕۆژنامەو گۆڤارێکە لەو جۆرە چاپەمەنیانە(١) :

**١ - ڕۆژنامەی ( بانگی حەق )(٢)**

**٢ - گۆڤاری ( پەیژە )**

گۆڤارێکی ئەدەبیو کۆمەڵایەتی بووە •

خاوەنی / مستەفا شەوقی •

شوێنی دەرچوونی / بەغدا •

مێژووی ڕێپێدانی / ٢٩/ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٦ •

مێژووی دەرچوونی / تەنیا یەك ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە ئەویش لە ساڵی ١٩٢٧ بووە •

ئەوەی شایانی باسە مامۆستا ( مومتاز حەیدەری ) ئەم ڕۆژنامەیەی بە لێکۆڵینەوەیێکی تێرو تەسەل بە ناوی ( مستەفا شەوقیو پەیژە ) بڵاو کردۆتەوە(٣) •

**٣ ـ گۆڤـاری ( زانستی )**

گۆفارێـکی ئەدەبیو مێژوویی نیو مانـگی بووە •
خـاوەنی / سالح قەفتـــان •
شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •
مێژووی دەرچوونی / تەنیـــا یەك ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە ئەویش لە ٢٥/ی شوباتی ساڵی ١٩٣٨ بووە •

**٤ ـ گۆڤاری ( هاواری نیشتمان )(٤)**

**٥ ـ ڕۆژنامەی ( ڕێـگا )**

ڕۆژنامەیێکی سیاسی بووە •
سەرەکی نووسینی / حەسەن قزلجی •
شوێنی دەرچوونی / مەهاباد •
مێژووی دەرچوونی / تەنیا یەك ژمارەی لێ بڵا کراوەتەوە ئەویش لە ساڵی ١٩٤٨ بووە(٥) •

**٦ ـ ڕۆژنامەی ( ڕاوێژ )**

ڕۆژنامەیێکی سیاسیی گشتی بووە •
شوێنی دەرچوونی / سنە •
مێژووی دەرچوونی / تەنیـــا یەك ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە ئەویش لە ساڵی ١٩٥٢ بووە •

ئەم ڕۆژنامەیە کۆمەڵێکی سیاسیی کوردی دەری کردووە •

٧ ـ گۆڤاری ( نیشتمان )(٦)

٨ ـ گۆڤاری ( هونەر )(٧)

٩ ـ گۆڤـاری ( گزنگ )(٨)

١٠ـ گۆڤاری ( ڕهێلە )(٩)

١١ـ گۆڤاری ( بیری نوێ )(١٠)

١٢ـ گۆڤاری ( ئەدیبی عیراقی )(١١)

---

(١) بۆ پێوانەی تەمەنی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان ئەو ڕۆژنامانەی لە (٣) ژمارە کەمترو ئەو گۆڤارانەی کە تەنیا یەك ژمارەیان لێ دەرچووە بە تەمەن کورتمان دانە قەڵەم ٠

(٢) دەربارەی ڕۆژنامەی بانـگی حـەق بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی لە نێوان سەربەستی‌و یاساکانی چاپەمەنیدا سـەردەمی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموودی نەمر / زنجیرە : ٣

(٣) مومتاز حەیدەری / مستەفا شەوقی‌و پەیژە / چاپی بەغدا/١٩٨٥

(٤) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی لە نێوان سەربەستی‌و یاساکانی چاپەمەنیدا / سەردەمی کۆماری مەهاباد / زنجیرە : ٦

(٥) جەمال خەزنەدار/ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی/لاپەڕە : ٥٤

(٦) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی قوتابخانەکان / زنجیرە : ١

(٧) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی قوتابخانەکان / زنجیرە : ٢

(٨) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی قوتابخانەکان / زنجیرە : ٤

(٩) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی قوتابخانەکان / زنجیرە : ٧

(١٠) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی قوتابخانەکان / زنجیرە : ٨

(١١) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی لە نێوان سەربەستی‌و یاساکانی چاپەمەنیدا / سەردەمی دوای شۆڕشی ١٤/ی تەمووزی ١٩٥٨ / زنجیرە : ٢٥

# ڕۆژنامەی فرە زمان

مەبەست لـە ڕۆژنامەی فرە زمان لێرەدا ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانـەن کە بە سێ زمان یاخود زیاتر بڵاو دەکرێنەوە •

ڕۆشنبیرانی کورد هەر هەڵێکیان بۆ ڕەخسابێ هەوڵی ئەوەیان داوە کە دەنـگی گەلەکەیان بگەیەننە زۆرترین کەس کە بتواندرێت ، هـەر بۆیەش ویستوویانە ئەو زمانانە بەکـار بێنن کـە توانیویانە ؛ بۆ ئەوەی دەنگیان بگەیەنە ئەو گەلانەش کە بەم زمانانە دەدوێن •

مێژووی ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی چەند نموونەیێکی لـەو جـۆرە ڕۆژنامەو گۆڤارانەی بە خۆوە بینیوە :

**١ ـ گۆڤاری ( کوردستان )**

خاوەنی / سەید حوسێن حوزنی موکریانی •

شوێنی دەرچوونی / ئەستانبۆڵ •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ٣٠/ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٩ بڵاو کراوەتەوە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (١٩) بووە کە لە ٢٩/ی ئاداری ساڵی ١٩٢٠ دەرچووە .

بە پێنج زمانان : کوردی ، تورکی ، عەرەبی ، فارسی ، فەڕەنسەیی وتاری بڵاو دەکردەوە[1] .

**٢ ـ ڕۆژنامەی ( بانگی کوردستان )[2]**

**٣ ـ گۆڤاری ( دیاری کوردستان )**

گۆڤارێکی ئەدەبیو کۆمەڵایەتی وێنەداری هەفتانە بووە .

خاوەنی / ساڵح زەکی ساحێبقران .

شوێنی دەرچوونی / بەغدا .

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ١١/ی ئاداری ساڵی ١٩٢٥ دەرچووە .

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (١٦) بووە کە لە ١١/ی مایسی ساڵی ١٩٢٦ دەرچووە .

بە هەر سێ زمانی کوردی ، عەرەبی ، تورکی دەرچووە .

**٤ ـ گۆڤاری ( ژین )**

گۆڤارێکی نیو مانگی بووە .

خاوەنی / سوڕەیا بەدرخان .

شوێنی دەرچوونی / قاهیرە .

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ساڵی ١٩١٦ بڵاو کراوەتەوە .

بە سێ زمانان : کوردی ، عەرەبی ، تورکی وتاری بڵاو کردۆتەوە .

ئەم گۆڤارە بەردەوامی ڕۆژنامەی کوردستان بووە[3] .

**٥ ـ گۆڤاری ( دەنگی قوتابیان )(٤)**

**٦ ـ ڕۆژنامەی ( ڕێگای یەکێتی )**

ڕۆژنامەیێکی سیاسی‌ی مانگانە بووە لەلایەن کۆمەڵێکی سیاسی‌ی ئێرانی دەرچووە ، دروشمی ( یەکێتی ـ تێکۆشان ـ سەرکەوتن )ی لەسەر دەنووسرا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی نیسانی سالی ١٩٧١ دەرچووە •

تا کۆتایی سالی ١٩٧٣ بەردەوام بووە •

بە پێنج زمانان : کوردی ، فارسی ، عەرەبی ، بلووجی ، تورکی وتاری بلاو کردۆتەوە •

**٧ ـ گۆڤاری ( کوردستان )(٥)**

**٨ ـ گۆڤاری ( کۆلیجی ئەدەبیات )(٦)**

**٩ ـ گۆڤاری ( زانکۆ )(٧)**

---

(١) د٠ کەمال مەزهەر ئەحمەد / تێگەیشتنی ڕاستی / لاپەڕە : ٢٣٣
(٢) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردی لە نێوان سەربەستی‌و یاساکانی چاپەمەنیدا / سەردەمی فەرمانڕەوایی شێخ مەحمود / زنجیرە:١
(٣) جەمال خازنەدار / ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی/لاپەڕە : ٢١
(٤) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی قوتابیان / زنجیرە : ٣
(٥) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی قوتابیان / زنجیرە : ٢
(٦) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی قوتابخانەکان / زنجیرە : ٩
(٧) بڕوانە : ڕۆژنامەنووسی‌ی قوتابخانەکان / زنجیرە : ١١

# ڕۆژنامەنووسیی مامۆستایان

دەڵێن : مامۆستایان پێشەوای گەلن •

مامۆستایان چینێـــکی ڕۆشنبیرو پێشکەوتوو و لێهاتووی ئـــەم نەتەوەیەن ، جێگایێکی تایبەتیو دیاریان هەیە لە تێکۆشانو پێشـــکەوتنی میللەت ، هەردەم لـــە ڕیزی پێشەوەی کاروانی گەشەکردنی وشـــەی پاكو ڕەسەنی کوردی دوانەکەوتوونە •

مامۆستایان سەرەڕای ئەوەی کـــە بەرپرسیارن لە پەروەردەکردنی نەوەی نوێ بە پەروەردەیێکی ڕاستو دروستو هەمیشە لـــەم ڕێـــگا پیرۆزەدا دریغیان نەکردووە ، ڕێکخراوەکانیشیان وەکـــو کۆمـــەڵەی مامۆستایانو یەکێتیی مامۆستایانو جڤاتی مامۆستایان تا ئێستا چـــەند ڕۆژنامـــەو گۆڤاری پەروەردەییو ڕۆشنبیریی سەرکەوتوویان پێشکەش بە کاروانی ڕۆژنامەنووسیی کوردی کردووەو هەر یەك لـــەم ڕۆژنامەو گۆڤارانە لە کاتی خۆیاندا مەشخەڵێك بوونەو ئاسۆی بیری خوێنەریان ڕۆشن کردۆتەوە :

١ ـ ڕۆژنامەی ( هەولێر )

ڕۆژنامەیێکی ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتیی هەفتانە بووە بە کوردیو عەرەبی دەرچووە •

خاوەنی / کۆمەڵەی مامۆستایان لە هەولێر •

بەرپرسیاری / مامۆستا جەمیل ڕەشید ئامێدی •

دەستەی نووسەران / مامۆستایان : عەبدولمەجید حەسەن ، عیززەددین فەیزی ، ئەستێر سەعید • لە ڕۆژی ٣٠/ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٢ ،امۆستا حوسێن ڕەشوانی لە جێی مامۆستا عەبدولمەجید حەسەن داندرا •

کارگێڕی / مامۆستا جەمال جەمیل •

شوێنی دەرچوونی / هەولێر •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ١٦/ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٠ دەرچووە •

هەتا بەرواری ٢٨/ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٣ بەردەوام بووە•

ئەم ڕۆژنامەیە یەکەمین ڕۆژنامەی مامۆستایانە لە کوردستاندا •

٢ ـ گۆڤاری ( بلێسە )

گۆڤارێکی ئەدەبیو زانیاریو کۆمەڵایەتیی ،انگانە بووە •

خاوەنی / جڤتی ،امۆستایان لە سلێمانی •

شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٥٩ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (١٠) بووە کە لە مایسی ساڵی ١٩٦٠ دەرچووە •

**٣ ـ گۆڤاری ( دەنگی مامۆستا )**

گۆڤارێکی پەروەردەیی‌و ڕۆشنبیری مانگانە بووە •
خاوەنی / یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان ـ لقی سلێمانی •
سکرتێری نووسین / مامۆستا محەمەد نووری تەوفیق •
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی شوباتی سالی ١٩٧١ دەرچووە •
تا کۆتایی سالی ١٩٧٣ بەردەوام بووە •

**٤ ـ گۆڤاری ( هیڤی )**

گۆڤارێکی مانگانە بووە •
خاوەنی / یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان ـ لقی دهۆك •
شوێنی دەرچوونی / دهۆك •
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە سالی ١٩٧١ دەرچووە •
چەند ژمارەیێکی کەمی لێ بلاو کراوەتەوە(١) •

**٥ ـ گۆڤاری ( بۆپێشەوە )**

گۆڤارێکی پەروەردەیی گشتی بووە •
خاوەنی / جڤاتی مامۆستایانی کوردستان ـ لقی هەولێر •
سەرۆکی نووسین / مامۆستا عوسمان حەسەن دزەیی •
سکرتێری نووسین / مامۆستا محەمەد حەسەن مەنگوڕی •
شوێنی دەرچوونی / هەولێر •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی شوباتی سالی ١٩٧٣ دەرچووە •

تەنیا دوو ژمارەی لێ بلاو کراوەتەوە •

٦ ـ گۆڤاری ( ئامانج )

خاوەنی / یەکێتیی ماموستایانی کوردستان ـ مەکتەبی سکرتاریەت
شوێنی دەرچوونی / بەغدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە کانوونی دووەمی ١٩٧٤ دەرچووە •

چەند ژمارەیێکی کەمی لێ بلاو کراوەتەوە(٢) •

---

(١) د• کەمال مەزهەر ئەحمەد / تێگەیشتنی ڕاستی / لاپەڕە : ٢٥٥
(٢) هەمان سەرچاوە / لاپەڕە : ٢٦٠

# ڕۆژنامەنووسی‌ی قوتابیان

لـە مێژووی ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردیدا چاومان بە چەند گۆڤارێکی قوتابیان دەکەوێ کـە ڕێـکخراوو یەکێتی‌و لێژنەکانی قوتابیـان بڵاویان کردۆتەوەو ئەو گۆڤارانەش ـ سەرەڕای تەمەن کورتی زۆربەیشیان ـ ڕۆڵێـکی دیاریان هـــەیە :

**١ ـ گۆڤاری ( دەنـگی قوتابیان )**

گۆڤارێـکی قوتابیان بووە •

خاوەنی / یەکێتی‌ی قوتابیانی گشتی‌ی عیراق •

شوێنی دەرچوونی / بەغـــدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مایسی ســـــاڵی **١٩٥٩** دەرچـــووە •

چوار ژمـارەی لێ بڵاو کراوەتەوە •

**٢ ـ گۆڤاری ( کوردستان )**

گۆڤارێـکی خوێندەواری بووە •

خاوەنی / کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوڕوپا •

سکرتێری نووسین / سەلاحەددین محەمەد سەعدوللا •

شوێنی دەرچوونی / ئەوروپا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی ئاداری ساڵی ١٩٥٨ دەرچووەو ئەم ژمارەیەی بە ئینگلیزی بووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی کە ژمارە (١٦) بووە لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٢ بڵاو کراوەتەوە •

بە کوردیو عەرەبیو ئینگلیزیو ئەڵەمانی دەرچووە •

## ٣ ـ گۆڤاری ( دەنگی قوتابیان )

گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی گشتی بووە •

خاوەنی / یەکێتیی قوتابیانی گشتیی عیراق ـ لقی کەرکووك •

شوێنی دەرچوونی / کەرکووك •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ساڵی ١٩٥٩ دەرچووە •

سێ ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە •

بە کوردیو عەرەبیو تورکی دەرچووە •

## ٤ ـ گۆڤاری ( هیوای کوردستان )

گۆڤارێکی وێژەییو کۆمەڵایەتی قوتابیان بووە •

خاوەنی / یەکێتیی قوتابیانی گشتی لە سلێمانی •

شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٩ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (١٣) بووە کە لە ١٩/ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٠ دەرچووە •

**٥ ـ گۆڤاری ( گزنگ )**

گۆڤارێکی وێژەیی و خوێندەواری و کۆمەڵایەتیی قوتابیان بووە •

خاوەنی / یەکێتیی قوتابیان ـ لێژنەی دواناوەندی قوتابخانەی ئێوارانی سلێمانی •

شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ساڵی ١٩٥٩ دەرچووە(١) •

**٦ ـ گۆڤاری ( ژیان )**

گۆڤارێکی قوتابیان بووە •

خاوەنی / یەکێتیی قوتابیانی گشتیی عێراق ـ لقی هەولێر •

شوێنی دەرچوونی / هەولێر •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٠ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (٢) بووە کە لە ساڵی ١٩٦١ دەرچووە •

**٧ ـ گۆڤاری ( پرشنگ )**

گۆڤارێکی وێژەیی ، زانستی ، کۆمەڵایەتی بووە •

خاوەنی / کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا •

دەستەی نووسەران / کەمال فوئاد ، ئیحسان فوئاد ، مارف خەزنەدار ، کلوس فەفتان •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٦ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی کە ژمارە (٢) بووە لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٦٧ دەرچووە •

**٨ - گۆڤاری ( خەباتی قوتابیان )**

گۆڤارێکی دەوری‌ی قوتابیان بووە بە کوردی‌و عەرەبی بڵاو کراوەتەوە •

خاوەنی / یەکێتی‌ی قوتابیانی کوردستان - مەکتەبی سکرتاریەت •
شوێنی دەرچوونی / بەغدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٠ دەرچووە •

چەند ژمارەیێکی لێ بڵاو کراوەتەوە •

---

(١) عەبدولجەبار جەباری / مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی/لاپەڕە:١٢١

# ڕۆژنامەنووسیی قوتابخانەکان

ڕۆژنامەنووسیی قوتابخانەکان ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەن کــە لــە خوێندنــگاکان لەلایەن مامۆستاو قوتابیانی خوێندنگاکە دەردەچن .

زۆربەی ئەو جۆرە گۆڤارانە ئەدەبیو پەروەردەیین ، لایەنێــکی دیــکەی ئەم جۆرە چاپەمەنیانە تەمەن کورتیە ، زۆربەی ئەو بلاوکراوانە هەرچەندە بە گۆڤاری سالانەش ناوبراون تەمەنیان لە دوو ؛ سێ ژمــارە پتر نەبووە ، هۆی ئەم تەمەن کورتییەش چەند خالێــکن گرنــگەکانیان ئەمــــانەن :

١ ـ گوێزرانەوەی ئەو مامۆستایانەی کــــە سەرپەرشتیی دەرکردنی گۆڤارەکەیان گرتبووە ئەستۆ بۆ قوتابخانە یان شوێنێکی دی .

٢ ـ گۆڕینی بەڕێوەبەری قوتابخانەکە .

٣ ـ کورتیو کــەمی ماوەی قۆناغی خوێنــدن لەو قوتابخانانەی کــە گۆڤارەکەیان دەرکردووە ؛ چونــکە زۆربەی ئەو قوتابخانانە یــان ئامادەیی یاخــۆ قوتابخانەی مامۆستایان بوونە ، دیارە کــە ماوەی قۆناغی خوێندنیش لە هەر کامیان لە سێ سال زیاتر نیـــەو بــە

دەرچوونی ئەو قوتابیانەی کــە هاوبەشیی دەرکردنی گۆڤارەکەیان کردووە ئەویش یەکی کەوتووەو قوتابیانی ئەوتۆ جێگای ئەمــــانی نەگرتۆتەوە تاکو ڕێڕەو بەردەوام بێتو گۆڤارەکە لــــە دەرچوون نەکـــەوێ •

ئەم گۆڤارانەی خوارەوەش بەرهەمی خوێندنگاکانن(١) :

**١ ـ گۆڤاری ( نیشتمان )**

گۆڤارێــکی وێژەییو زانیاریو کۆمەڵایەتی بووە •

خاوەنی / قوتابخانەی مامۆستایانی سەرەتایی کوڕان لە سلێمانی •

دەستەی نووسەران / مامۆستایان : محەمەد سلێمان ، عــەبدوڵڵا زێباری ، ئیبراهیم محەمەد ، بە هاوکاری لەگەڵ قوتابیان : محەمەد مەجید، فائیق محەمەد عەبدوڵڵا ، زاهیدە قەرەداغی ، سەلاح یووسف •

شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •

مێژووی دەرچوونی / تەنیا یەك ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە ئەویش لە مانــگی ئاداری ساڵی ١٩٥٩ •

**٢ ـ گۆڤاری ( هونـــەر )**

گۆڤارێــکی هونەری بووە •

خاوەنی / قوتابخانەی هونەری ناوماڵ لە سلێمانی •

دەستەی نووسەران / نەسرین محەمەد ، گێلاس ڕەئووف ، لوێزە کاکــە حەمــــە •

شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ساڵی ١٩٥٩ دەرچووە •

وا پێ دەچێ هەر ئەو ژمارەیەی لێ دەرچووبێ •

**٣ ـ گۆڤاری ( ڕابەر )**

گۆڤارێـکی قوتابخانەیی‌و پەروەردەیی ساڵانە بووە •

خاوەنی / قوتابخانەی ( مەلکەندی )ی ســـەرەتایی کوڕان لـــە سلێمانی •

سەرۆکی نووسین / مامۆستا مستەفا ساڵح کەریم •

دەستەی نووسەران / فوئاد محەمەد ئەمین ، ڕەئووف ئەحمـــەد حەســـەن •

شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانـگی نیسانی ســـاڵی ١٩٦٦ دەرچـووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (٣) بووە کە لە ســـاڵی ١٩٦٨ دەرچـــووە •

**٤ ـ گۆڤاری ( گزنگ )**

گۆڤارێـکی قوتابخانەیی‌و پەروەردەیی بووە •

خاوەنی / قوتابخانەی مەناری سەرەتایی کوڕان لە سلێمانی •

دەستەی نووسەران / عەبدولکەریم محەمەد باراوی ، عەبدولکەریم ساڵح زەندی ، محەمەد ساڵح سەعید ، عەبدولقادر مـــەلا عومـــەر ، عەبدولمەجید محەمەد کەریم ، عەبدولسەمیع ئەحمەد •

شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •

مێژووی دەرچوونی / تەنیا یەك ژمارەی لێ دەرچـــووە ئەویش لـە سـاڵی ١٩٦٧ بووە •

ژمارە دووی بە ناوی ( چیا ) دەرچووە •

**٥ ـ گۆڤاری ( چیـا )**

گۆڤارێـکی قوتابخانەیی‌و پەروەردەیی ساڵانە بووە •

خاوەنی / قوتابخانەی مەناری سەرەتایی کوڕان لە سلێمانی •

دەستەی نووسەران / عەبدولکەریم محەمەد ئەحمەد ، محەمـەد سالح سەعید ، عەبدولمەجید محەمەد کـەریم ، جـەمال نوری محیەددین ، محەمەد غەریب ڕەئووف ڕەشید •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (٢)ی لە ساڵی ١٩٦٨ دەرچـووە • ژمارە (یەك)ی بە ناوی (گزنگ) لە ساڵی ١٩٦٧ دەرچووە •

تەنیا ئەو ژمارەیەی لێ بڵاو کراوەتەوە •

**٦ ـ گۆڤاری ( تیشك )**

گۆڤارێـکی پەروەردەیی ساڵانە بووە •

خاوەنی / قوتابخانەی مامۆستایانی سەرەتایی کوڕان لە هەولێر •

دەستەی نووسەران :

١ ـ مامۆستا مەجید ئاسنگەر / بەڕێوەبەری قوتابخانە •

٢ ـ مامۆستا حەمـە کەریم ڕەمەزان هـەورامی / مامۆستای پەروەردەو زانستی هۆڵمان •

٣ ـ مامۆستا فاتیح محەمەد / مامۆستای زمانی کوردی •

٤ ـ لێژنەی : آ ـ پەروەردەو زانستی هۆڵمان •

ب ـ زمـانی کوردی •

٥ ـ سکرتێری لێژنەکان / نووری ئیسماعیل نانەکەلی •
شوێنی دەرچوونی / هـــەولێر •
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ساڵی ١٩٦٩ دەرچـووەو بەڕۆنیۆ چاپـکراوە •
دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (٢) بووە کە لە ســـاڵی ١٩٧٠ دەرچـــووە •

**٧ ـ گۆڤاری ( ڕهێلە )**

گۆڤارێـکی ڕۆشنبیری‌و پەروەردەیی ساڵانە بووە •
خاوەنی / خوێندنـگای دواناوەندەی هەولێری کوڕان •
دەستەی نووسەران :

١ ـ مامۆستا عەبدولڕەحمان ئەلسەعدی / مامۆستای زمانی کوردی
٢ ـ لێژنەی زمانی کوردی :

آ ـ عوسمان حەمەد دەشتی / سکرتێری گشتی •
ب ـ ئەندامانی لێژنە :

١ ـ دلشاد عەبدوللا سنجاوی •
٢ ـ تاریق حوسێن •
٣ ـ ڕەهبەر جەلال مامەش •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ساڵی ١٩٧١ دەرچووە •
تەنیا ئەم ژمارەیەی بەم ناوە دەرچووەو ساڵی دوایی بە ناوی (بیری نوێ) دەرچـــووە •

٨ ـ گۆڤاری ( بیری نوێ )

گۆڤارێکی ئەدەبیو زانستیی گشتی سالآنە بووە •

خاوەنی/لیژنەی زمانو ئەدەبی کوردی لە خوێندنگای دواناوەندیی هــەولێری کوڕان •

دەستــەی نووسەران / مــامۆستا عەبدولڕەحمان ئەلسەعدی / سەرۆکی لیژنە • کاردۆ عەبدولقەهار گەلآلی/سکرتێری لیژنە•عەبدوللا محەمەد زەنگەنە • تاهیر حوسێن هەمەوەند •

شوێنی دەرچوونی / هــەولێر •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانــگی ئاداری ســـالی ١٩٧٢ دەرچـــووە •

هەر ئەو ژمارەیەی لێ بلآو کراوەتەوە •

٩ ـ گۆڤاری ( کۆلیجی ئەدەبیات )

گۆڤارێکی زانستیو ئەکادیمیە بە زمـــانی عەرەبیو کوردیو ئینگلیزی دەرچـووە •

خاوەنی / کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا •

سکرتێری بەشە کوردیەکەی / د• مارف خەزنەدار •

شوێنی دەرچوونی / بەغـــدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە سالی ١٩٧٢ دەرچووە •

ژمارە (٢٣)ی لە سالی ١٩٧٩ دەرچووە •

١٠ـ گۆڤاری ( بەرەو ڕووناکی )

گۆڤارێکی وێژەییو ڕۆشنبیریی گشتی بووە •

خاوەنی / لێژنەی زمانو وێژەی کوردی لە خوێندنگای ناوەندەیی گەلاڵەی کوڕان •

دەستەی نووسەران / ئیبراهیم سەعید بەرزنجەیی ، نەژاد عەزیز سورمێ ، سەردار کەمال مەولود ، ئازاد عەبدولوەهاب جوندیانی ، غەفوور حوسێن گەلاڵی •

شوێنی دەرچوونی / گەلاڵە •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ساڵی ١٩٧٢ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (٣) بووە کە لە ساڵی ١٩٧٣ دەرچووە •

## ١١ـ گۆڤاری ( زانکۆ )

گۆڤارێکی زانیاریە بە عەرەبیو کوردی ئینگلیزی دەرچووە •

خاوەنی / زانکۆی سلێمانی •

سەرۆکی نووسین / د• تاریق حەسەن ئامێدی •

سکرتێری نووسین / د• فاڕووق یەعقووب یوسفی •

ئەندامان / د• سەباح فەخری ، د• محەمەد فەهمی ئەحمەد ، د• فەساحەت حوسێن عەلی خان ، د• موشتاق ئەحمەد ، مامۆستا شەماڵ جەلال سائیب •

شوێنی دەرچوونی / سلێمانی •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ساڵی ١٩٧٥ دەرچووە •

ژمارە (٢)ی بەرگی (٧)ی لە ساڵی ١٩٨١ دەرچووە •

١٢- گۆڤاری ( گولاله )

بلاوکراوەیکی قوتابخانەیە ، بە کوردیو عەرەبی دەرچووە .
خاوەنی / قوتابخانەی (زانکۆ)ی نموونەیی سەرەتایی .
هەڵسووڕێنەری / مامۆستا نەرگز نووری مەحموود .
شوێنی دەرچوونی / سلێمانی .
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ساڵی خوێندنی ١٩٧٦ - ١٩٧٧ دەرچووە .

١٣- گۆڤاری ( ئاسۆی زانکۆیی )

گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی گشتی بووە ، بە کوردیو عەرەبی دەرچووە .
خاوەنی / زانکۆی سلێمانی - مەڵبەندی ڕۆشنبیریی کۆمەلایەتی .
سەرۆکی نووسین / د. هادی کازم عەوەز .
سکرتێری نووسین / عەبد عەلی حەسەن خەففاف .
دەستەی نووسەران / د. کامل حەسەن بەسیر ، د. ماجید بەشیر ، د. محەمەد فازیل قەفتان ، د. کامیل عەبدولحەمید ، عەلی حوسێن حەسەن ، سەبیح حموود ، کامەران موکری ، فریاد فازیل زەنگەنە ، سەباح میرزا ئەحمەد .
مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانگی مایسی ساڵی ١٩٧٧ دەرچووە .

---

(١) مەبەست لە خوێندنگا لێرەدا مانا فراوانەکەیەتی کە قوتابخانەو ئامۆژگاو کۆلیجو زانکۆ دەگرێتەوە .

# ڕۆژنامەنووسی‌ی منداڵان

جیهانی منداڵان جیهانێکی ڕەنگاو ڕەنگە ، جیهانێکی پاك و بێ تاوان و بێ فڕوفێڵە ، جیهانی گەشبینی و سادەییە ، جیهانی پێکەنین و یاریـــیە .

منداڵان جگەرگۆشەکانمانن ، مرۆڤی دوا ڕۆژن ، پەروەردە ـ کردنیـــان بە شێوەیێـــکی ڕاست و زانستیانە واتای ئەوەیە دواڕۆژی میللەتەکەمان گەشتر دەکەین و لەسەر بنچینەیێکی پتـــەوتر دروستی دەکەینــــەوە .

گەلانی پێشکەوتوو بایەخێکی زۆر بە ڕۆشنبیری‌ی منــــداڵان دەدەن و دەیان گۆڤاری ڕەنگاوڕەنگی وێنـــەداریان بۆ دەردەچوێنن و کتێبخانەکانیان پڕیەتی لە بەرهەمی منداڵان ؛ کەچی نامەخانەی کوردی هێشتا لـــە ســـەرەتا دایە ، لە تەمـــەنی نەوەد ساڵەی ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردیدا تەنیا (٣) گۆڤاری منداڵان بڵاو کراونەتەوە و ئەمانیش هـــەر بە ساوایی خنکێنراون وەکو بڵێی منداڵانی کورد مافی ئەوەیان نەبێت لـــە هەموو خاکی پان و بەرینی کوردستاندا تەنیا یەك گۆڤاری هـــەفتانە و تەنانەت مانـــگانە و ساڵانەیشیان هـــەبێ .

منداڵانمان چۆن پێویستیان بە خۆراك هەیە بۆ گەشەکردنی لەشیانو پێویستیان بە پۆشاك هەیە بۆ پاراستنیانو پێویستیان بە قوتابخانە هەیە بۆ فێرکردنو فراوان کردنی ئاسۆی ڕۆشنبیریان ؛ هەر ئاواش پێویستیان ـ بەلای کەمەوە ـ بە گۆڤارێکی کوردیی حەفتانەی ڕەنگاوڕەنگی وێنەداری منداڵان هەیە کە دەزگاینکی ڕۆشنبیریی کوردی بە ڕێكوپێکی دەری بچوێنیو هەڵسووڕێنەرو نووسەرانیشی لە کەسانی دڵسۆزو پاكو شارەزا بنو ئامانجیان هەر پەروەردە کردنی منداڵانی کورد بێ بە شێوەیێکی ڕاستو دروستو کوردانە بە هەموو مانا فراوانەکەیەوە •

ئێمە لەم ڕووەوە قەرزداری منداڵانینو ئۆباڵیان لە ئەستۆماندایەو لە دوا ڕۆژدا کە پێگەیشتن پەنجەی تاوانجو سەرزەنشتمان بۆ درێژ دەکەن :

**١ ـ گۆڤاری ( گروگاڵی منداڵانی کورد )**

گۆڤارێکی منداڵان بووە •

شوێنی دەرچوونی / مەهاباد •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە بەهاری ساڵی ١٩٤٦ دەرچووە •

ژمارە سێ‌ی لە حوزەیرانی هەمان ساڵ بڵاو کراوەتەوە •

قادری مودەڕیسی سەرپەرشتیی دەرچواندنی دەکرد •

**٢ ـ گۆڤاری ( ئەستێرە )**

گۆڤارێکی منداڵان بووە ، پاشکۆی گۆڤاری ڕۆژی کوردستان بووە •

خاوەنی / کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کوردی •

سەرەکی نووسین / ساڵح یووسفی •

دەستەی نووسەران / ڕزگار شــــەوقی ، ئەحمەد سەید عــەلی بەرزنجەیی ، عەبدولکەریم مەحموود شێخانی ، ســـدیق مەحمـــوود بەرزنجـــەیی •

شـــوێنی دەرچوونی / سلێمانی •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە هاوینی ســـاڵی **١٩٧٢** دەرچـــووە •

**٣ ـ گۆڤاری ( ئەستێرە )**

گۆڤارێـــکی منداڵانی مانـــگانە بووە •

خاوەنی / بەڕێوەبەرێتی گشتیی ڕۆشنبیریی کوردی •

سەرۆکی نووسین / دوکتۆر ئیحسان فوئاد •

سکرتێری نووسین / جەمال خەزنەدار •

شوێنی دەرچوونی / بەغــــدا •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە مانـــگی مایسی ســــاڵی **١٩٧٥** دەرچـــووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە **(٢)** بووە کە دەرچووە •

# ڕۆژنامەی دەستنووس

ڕۆژنامەی دەستنووس ئەو ڕۆژنامە نیمچە ئاشکرایانەن کە بە شێوەیێکی نایاسایی و بەبێ ڕەزامەندی میری و بە دەستخەت دەردەچن •

مامۆستا ( شاکر فەتتاح ) لەم بوارەدا دەستێکی باڵای هەبووەو بە تەنیا چەند ڕۆژنامەیێکی دەستنووسی دەکردووە ؛ لەو کاتەی کە بەڕێوەبەری ناحیەی (خورماڵ) و (قادر کەرەم) و قائیمقامی شارۆچکەی ( چەمچەماڵ ) بووە :

**١ ـ ڕۆژنامەی ( خورماڵ )**

ڕۆژنامەیێکی دەستنووس بووە •

شوێنی دەرچوونی / خورماڵ •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ٣/ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٠ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (٢٤) بووە کە لە ٢٤/ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٠ دەرچووە •

**٢ ـ ڕۆژنامەی ( باسەرە )**

ڕۆژنامەیێکی دەستنووس بووە •

شوێنی دەرچوونی / قادر کەرەم •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە ( یەك )ی لە ٢٥/ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٢ دەرچووە •

دوا ژمارەی/دوا ژمارەی ژمارە (٢٤) بووە کە لە ٢٣/ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ دەرچووە •

**٣ ـ ڕۆژنامەی ( چەمچەماڵ )**

ڕۆژنامەیێکی مێژوویی هەفتانەی دەستنووس بووە •

خاوەنو سەرنووسەری / شاکر فەتتاح •

شوێنی دەرچوونی / چەمچەماڵ •

مێژووی دەرچوونی / ژمارە (یەك)ی لە ١/ی تەمووزی ساڵی ١٩٤٦ دەرچووە •

دوا ژمارەی / دوا ژمارەی ژمارە (٧) بووە کە لە ١٢/ی ئابی ساڵی ١٩٤٦ دەرچووە[١] •

ئەوەی شایانی باسە مامۆستا شاکر فتاح جگە لەم ڕۆژنامانە لە شاری ئەکرێش لە ماوەی نێوان ١٥/٧/١٩٥٠ هەتا ١٥/٩/١٩٥٠ ڕۆژنامەیێکیشی بە ناوی (ئاکرێ) دەرکردووە بەڵام ئەمیان بە زمانی عەرەبی بووەو لە ساڵی (١٩٨٤) یشدا ژمارەکانی ئەم ڕۆژنامەیەی کۆکردۆتەوەو وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردیو چاپی کردووە[٢] •

---

(١) دەربارەی ئەم ڕۆژنامە دەستنووسانە بڕوانە :
١ ـ عەبدولجەبار جەباری / مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی/لاپەڕە: ١٦١ و ١٦٢
٢ ـ شاکر فەتتاح / کۆمەڵە ڕۆژنامەی چەمچەماڵ / چاپی بەغدا ١٩٨٣

(٢) بڕوانە : شاکر فەتتاح / ڕۆژنامەی ئاکرێ / چاپی بەغدا ١٩٨٤

# سەردانەواندنێك بۆ ڕێبەرە نەمرەکانی کاروانی ڕۆژنامەنووسیی کوردی

ڕۆژی ۲۲/ی نیسانی ســـالی ۱۸۹۸ ڕۆژێـکی ورشەدارە لـــە مێژووی ڕۆشنبیریی نەتەوەی کوردد! ، ڕۆژی دەرچوونی یەکـەمین ڕۆژنامـــەی کوردییە لەلایەن کوردێـکی ڕۆشنبیر ؛ ڕۆشنبیرێـکی دلسۆز ؛ دلسۆزێـکی ڕاستەقینەی وشەی پاکی کوردی ؛ نەمر میقـداد مەدحـــەت بەگ .

بەلێ میقداد مەدحەت بەگی نەمر وەکو ڕۆشنبیرێـکی دووربین و ئاگادار هەستی بەو ڕاستیە کردبوو کە کوردیش نەتەوەیێکە تایبەتییەکانی خۆی هەیەو مافی ئەوەیشی هەیە وەکو نەتەوەکانی دراوسێی ـ کە لـەو لایەنەو زۆر لایەنی دیـکەش پێش کورد کەوتبوون ـ پێویستی بـــە دەرکردنی ڕۆژنامەیێکی وا هەیە کە بە تەواوی زمانی حالی ئەم کوردە بێت بە هەموو چین و لایەنەکانییەوەو بتوانێ دەنـگی زولالی ئەم نەتەوەیە بە ئاشکرا دەربڕێ ، چاکیش دەیزانی کـە ئەو لە خاکی ســـەر بـــە دەستەلاتی دەولەتی عوسمانیدا وەك لە گەرووی نەهەنگدا بێ وایـــە هەرگیز ناتوانێ ئەو پەیامە پیرۆزە وەکو پێویستە ڕابگەیێنێ و بۆ ئـــەم

مەبەستەش شاری (قاهیرە)ی هەڵبژارد کە تا ڕادەیێك ئەوکاتی سەربەستی تێدا هەبوو و کەمێکیش لە دەستەلاتی دەوڵەتی سوڵتان دوور بوو .

بەم جۆرە یەکەمین ژمارەی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی لە شاری قاهیرەی میسردا دەرچوو .

تا بەم شێوەیە میقداد مەدحەت بەگ بووە ڕابەرو سەرقافڵەچیی کاروانی شکۆمەندی ڕۆژنامەنووسیی کوردیو لەلایەن هەموو کوردێکی دڵسۆزیش بە نەمر دەژمێردرێت .

شۆرەسوارێکی دیکەی ئەم گۆڕەپانە نەمر حوسێن حوزنی موکریانییە ، مامۆستا حوزنی هەر لە ساڵی (١٩١٥) وە تا کۆچ کردنی لە ساڵی (١٩٤٣) هەموو ژیانو ڕابواردنو هەوڵدانێکی خۆی بۆ خزمەت کردنی مێژوو و ئەدەبو ڕۆشنبیریی کوردی تەرخان کردبوو ، جگە لە دەیان بەرهەمی بە نرخی مێژوویی زیاتر لە (١٠) ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی بە نهێنیو ئاشکرا دەرکردووەو لە زۆربەی کاتیشدا هەر خۆی بە تەنیا نووسەرو وێنەکێشو دەرهێنەرو چاپکەری ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بووە ؛ لە کاتێکدا کە نەزانینو دواکەوتن باڵی ڕەشیان بەسەر سەرتاپای کوردستان کێشابوو ، پاداشتیشی بەرانبەر بەم هەموو لەخۆ بووردنو خزمەت کردنە لە تواجو سەرزەنشتو بوختان دانە پاڵ بەملاوە هیچ دەستکەوتێکی کەی نەبووە ، بەڵام ئەو هەرگیز کۆڵی نەدەدا ، چونکە ئەو خۆنەویستو تێکۆشەر بوو ، دڵسۆزو کۆڵنەدەر بوو ، عاشقی وشەی ڕەسەنی کوردی بوو ، ئامانجی خزمەت کردن بوو ، چاوی لە پاداشتو خۆ دەرخستن نەبوو .

نەمری سێیەمی ئەم کاروانە پیرەمێردی شاعیرە ، ئەویش چوارێکە

سەدەیێکی تەواو بە ڕۆژنامەی (ژیان) و (ژین) ئەوپەڕی خزمـــەتی بێ پسانەوەی پێشکەش بە کورد کردووەو بە شیعرە ناسكو تەڕەکانیو بـــە نووسینـــە بەجۆشەکانیو بـــە پەندە نەستەقو پڕ واتاکانی لـــــە ( قەلەندەرخانە ) بچووکەکەیەوە تیشکی ڕووناکیی بۆ هەموو کوردستان بەخشیو بلاو کردۆتەوە •

ئەم نەمرانەو مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردی لە تەمەنی نـــەوەد ساڵەی خەباتی سەختی بێ پسانەوەیدا بە دەیان ڕووناکبیرو ســـەربازی دڵسۆزی دیـــکەی پێگەیاندووەو هەر یەکەیان وەکو مۆمێك پێشەنـــگی ئەو کاروانە پیرۆزەیان ڕۆشن کردۆتەوەو هەر یەکەشیان جێـــگایێـــکی تایبەتیو دیاریان بۆ خـــۆیان کردۆتەوەو مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردیش هەمیشە بە شنازییەوە باسیان دەکاتو ئافەرین لە کردەوەکانیان دەکات ، چونـــکە ئەمانە ڕۆشنبیری ڕاستەقینەی میللەتنو بە خامە پاکـــە نەترسەکانیان هـــەرگیز لـــە خزمەت کردنی وشـــەی کوردی کۆڵیان نـــەداوە •

نەمری بۆ ئەو کەڵە مرۆڤانەو جاویدانی بۆ گیانی پیرۆزیانو تەمەنی درێژیش بۆ ئەوانەی کە تا ئێستا ماون •

# پێڕستی ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان بە پێی ساڵی دەرچوونیان

| ســـاڵ | ڕۆژنامەو گۆڤارەکان |
|---|---|
| ١٨٩٨ | کوردستان ( ڕ ) |
| ١٩٠٧ | کـورد ( ڕ ) |
| ١٩١٢ | کوردستان ( گ ) |
| ١٩١٣ | ڕۆژی کورد ( گ )<br>یەکبوون ( گ ) |
| ١٩١٤ | بانـگی کورد ( گ ) أ<br>کوردستان ( گ ) |
| ١٩١٥ | کوردستان ( گ ) |
| ١٩١٧ | کوردستان ( ڕ ) |

| ساڵ | ڕۆژنامەو گۆڤارەکان |
| --- | --- |
| ١٩١٨ | تێگەیشتنی ڕاستی ( ڕ ) |
| | ژیـن ( گ ) |
| ١٩١٩ | ژیـن ( ڕ ) |
| | کوردستان ( گ ) |
| ١٩٢٠ | پێشـکەوتن ( ڕ ) |
| ١٩٢١ | ڕۆژی کورد ( ڕ ) |
| ١٩٢٢ | بانـگی کوردستان ( ڕ ) |
| | ڕۆژی کوردستان ( ڕ ) |
| ١٩٢٣ | بانـگی حەق ( ڕ ) |
| | ئومێدی ئیستیقلال ( ڕ ) |
| ١٩٢٤ | ژیانـەوە ( ڕ ) |
| ١٩٢٥ | دیاری کوردستان ( گ ) |
| ١٩٢٦ | ژیـان ( ڕ ) |
| | زاری کرمانجی ( گ ) |
| ١٩٢٧ | بەیـژە ( گ ) |

| سـال | ڕۆژنامەو گۆڤارەکان |
|---|---|
| ١٩٣٠ | ڕێیا تـازە ( ڕ ) |
| ١٩٣٢ | هـاوار ( گ ) |
| ١٩٣٥ | ڕووناکی ( گ ) |
| ١٩٣٧ | زبـان ( ڕ ) |
| ١٩٣٨ | زانستی ( گ ) |
| ١٩٣٩ | زیـن ( ڕ ) |
| | گەلاوێـژ ( گ ) |
| ١٩٤١ | ڕوناهی ( گ ) |
| ١٩٤٣ | نیشتمان ( گ ) |
| | دەنگی گێتی تازە ( گ ) |
| | ڕۆژا نو ( گ ) |
| | ستێر ( گ ) |
| ١٩٤٥ | کوردستان ( گ ) |
| | ئـاوات ( گ ) |
| | هاواری کورد ( گ ) |

| ساڵ | ڕۆژنامەو گۆڤارەکان |
| --- | --- |
| ١٩٤٦ | کوردستان ( ڕ ) |
| | هەڵاڵە ( گ ) |
| | هاواری نیشتمان ( گ ) |
| | گڕوگاڵی منداڵانی کورد ( گ ) |
| | ئاگاو ڕووداوی هەفتەیی ( گ ) |
| ١٩٤٧ | کوردستان ( ڕ ) |
| ١٩٤٨ | ڕێگا ( ڕ ) |
| | نزار ( گ ) |
| | هەتاو ( ڕ )(١) |
| ١٩٥٠ | هەولێر ( ڕ ) |
| | تیرە بەغدایە ( گ ) |
| ١٩٥١ | خۆرنشین ( گ ) |
| ١٩٥٢ | ڕاوێژ ( ڕ ) |
| | پەیام ( گ ) |
| ١٩٥٤ | هەتاو ( گ ) |
| ١٩٥٥ | ڕێیا تازە ( ڕ ) ( بۆ جاری دووەم ) |

| ساڵ | ڕۆژنامەو گۆڤارەکان |
|---|---|
| ١٩٥٧ | هیـوا ( گ ) |
| ١٩٥٨ | پێشکەوتن ( ڕ ) |
| | شەفەق ـ بەیـان ( گ ) |
| | پێشکەوتن ( گ ) |
| | کوردستان ( گ ) |
| ١٩٥٩ | بـرایەتی ( ڕ ) |
| | خەبـات ( ڕ ) |
| | ڕاسـتی ( ڕ ) |
| | کوردستان ( ڕ ) |
| | ئـازادی ( ڕ ) |
| | ڕای گەل ( ڕ ) |
| | نیشتمان ( گ ) |
| | ڕزگاری ( گ ) |
| | نـەورۆز ( گ ) |
| | ئافرەت ( گ ) |
| | بڵێسـە ( گ ) |
| | هیوای کوردستان ( گ ) |
| | دەنـگی قوتابیان ( گ ) |
| | دەنـگی قوتابیان ( گ ) |
| | هونـەر ( گ ) |
| | گزنـگ ( گ ) |

| ساڵ | ڕۆژنامەو گۆڤارەکان |
| --- | --- |
| ١٩٦٠ | کوردستان ( ڕ ) |
| | بـﮦڕوا ( ڕ ) |
| | دەنــگی کورد ( ڕ ) |
| | ڕۆژی نوێ ( گ ) |
| | چارەسەرکردنی کشتوکاڵ ( گ ) |
| | عیراقی نوێ ( گ ) |
| | ژیـــان ( گ ) |
| | ڕۆناهی ( گ ) |
| ١٩٦١ | کوردستان ( ڕ ) |
| | ئەدیبی عیراقی ( گ ) |
| ١٩٦٢ | هەولــێر ( ڕ ) |
| | دیجلەو فوڕات ( ڕ ) |
| ١٩٦٣ | ڕاپــەڕین ( ڕ ) |
| | دەنــگ ( گ ) |
| ١٩٦٤ | گۆڤاری تووتن ( گ ) |
| ١٩٦٦ | دەنــگوباس ( ڕ ) |
| | ڕۆژ ( ڕ ) |
| | دەنــگی تازە ( گ ) |

| ســـاڵ | ڕۆژنامەو گۆڤارەکان |
| --- | --- |
| | پرشنــگ ( گ ) |
| | ڕابــەر ( گ ) |
| ١٩٦٧ | بـــرایی ( ڕ ) |
| | گزنــگ ( گ ) |
| ١٩٦٨ | سلێمانی ( گ ) |
| | کاری میللی ( گ ) |
| | چیــا ( گ ) |
| ١٩٦٩ | ڕووناکــی ( ڕ ) |
| | ڕزگاری ( گ ) |
| | بەیـــان ( گ ) |
| | تیشــك ( گ ) |
| ١٩٧٠ | هــاوکاری ( ڕ ) |
| | تیشکی هونەر ( گ ) |
| | ژیــن ( ڕ ) |
| | دفتەری کوردەواری ( گ ) |
| | هەولێر ( گ ) |
| | برایەتــی ( گ ) |
| | شۆڕشی کشتوکاڵ ( گ ) |
| | زانیــاری ( گ ) |

| سـال | ڕۆژنامەو گۆڤارەکان |
|---|---|
| | چیا ( گ ) |
| | گیتی بوول ( گ ) |
| | خەباتی قوتابیان ( گ ) |
| ١٩٧١ | کوردستان ( ڕ ) |
| | ڕێگای یەکێتی ( ڕ ) |
| | دەنگی جوتیار ( ڕ ) |
| | برایەتی ( ڕ ) |
| | پاشکۆی برایەتی ( ڕ ) |
| | دەنگی مامۆستا ( گ ) |
| | نووسەری کورد ( گ ) |
| | ڕۆژی کوردستان ( گ ) |
| | پەروەردەو زانست ( گ ) |
| | هیفی ( گ ) |
| | ڕهێلە ( گ ) |
| | چیا ( گ ) |
| | ڕوانگە ( گ ) |
| ١٩٧٢ | برایەتی ( ڕ ) |
| | بیری نوێ ( ڕ ) |
| | گزنگ ( گ ) |
| | نووسەری نوێ ( گ ) |

| ســـال | ڕۆژنامەو گۆڤارەکان |
| --- | --- |
| | بەرەو ڕووناکی ( گ ) |
| | ئەستێرە ( گ ) |
| | هوشیاری کرێکاران ( گ ) |
| | بیری نوێ ( گ ) |
| | گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات ( گ ) |
| | ڕەوشـــەن (٢) |
| ١٩٧٣ | بۆپێشـــەوە ( گ ) |
| | ڕۆشنبیر ( گ ) |
| | ڕۆشنبیری نوێ ( گ ) |
| | گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ( گ ) |
| | بابا گوڕگوڕ ( گ ) |
| | ڕاســتی ( گ ) |
| ١٩٧٤ | بــرایەتی ( ڕ ) |
| | ئامانــج ( گ ) |
| | ڕوناهــی ( گ ) |
| ١٩٧٥ | بــرایەتی ( ڕ ) |
| | ئەستێرە ( گ ) |
| | تۆتۆنۆمی ( گ ) |
| | زانسکۆ ( گ ) |

| سـال | ڕۆژنامەو گۆڤارەکان |
| --- | --- |
| ١٩٧٦ | ڕزگاری ( گ )<br>گوڵاڵـە ( گ ) |
| ١٩٧٧ | پاشکۆی عیراق ( ڕ )<br>ئاسۆی زانـکۆیی ( گ )<br>تریفە ( گ )<br>ڕەنجی کرێـکار ( گ ) |
| ١٩٧٨ | پاشکۆی شۆڕشی کشتوکاڵ ( گ ) |
| ١٩٧٩ | نووسەری کورد (گ) ( خولی دووەم ) |
| ١٩٨٠ | کاروانی ئافرەت ( گ )<br>شنروێ ( گ )<br>ئابووری زان ( گ ) |
| ١٩٨٢ | کاروان ( گ )<br>کشتوکاڵ ( گ )<br>خانزاد (٣) |
| ١٩٨٥ | کاروانی وەرزش ( ڕ )<br>نووسەری کورد ( گ ) ( خولی سێیەم )<br>دەنـگێ مـە ( گ ) |

| ساڵ | ڕۆژنامەوگۆڤارەکان |
|---|---|
| ١٩٨٦ | نەوروزی عیراق ( گ ) |
| ١٩٨٧ | تەندروستیو کۆمەڵ ( گ ) |
| | پاشکۆی هەفتانەی عیراق ( ر ) |
| | رەنگین ( گ ) |

(١) بۆ یەکەمین جار مامۆستا ( کەمال رەئووف محەمەد ) لە کۆرێکی ڕۆژنامە نووسی لە هەولێر ڕۆژی ٢٣/٤/١٩٨٦ ڕایگەیاند کە ئەم ڕۆژنامەیە یەکەمین ڕۆژنامەیە لە هەولێر دەرچووبێ •

(٢) ئەم گۆڤاری ڕەوشەنە ژمارەی لەسەر نیە •

(٣) بلاوکراوەیێکی یەکێتی ئافرەتانی هەولێرەو ئەویش ژماری لەسەر نیە •

## پێرستی ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان بەپێی شوێنی دەرچوونیان

| شوێن | ڕۆژنامە | گۆڤـار |
|---|---|---|
| بەغــدا | تێگەیشتنی ڕاستی | بانـگی کورد |
| | پێشکەوتن | دیاری کوردستان |
| | بانـگی کوردستان | پـەیژە |
| | برایەتی | گەلاوێـژ |
| | خـــەبات | دەنگی گێتی تازە |
| | ئازادی | ئاگاو ڕووداوی هەفتەیی |
| | دەنـگی کورد | نـزار |
| | کوردستان | تیرە بەغدایە |
| | دەنـگوباس | پـەیام |
| | برایی | هیـوا |

| شوێن | ڕۆژنامە | گۆڤار |
| --- | --- | --- |
| | ڕووناکی | پێشکەوتن |
| | هاوکاری | بەغدا |
| | دەنگی جوتیار | ئافرەت |
| | برایەتی | دەنگی قوتابیان |
| | بیری نوێ | چارەسەرکردنی کشتوکاڵ |
| | برایەتی | ڕۆناهی |
| | برایەتی | عیراقی نوێ |
| | باشکۆی عیراق | ئەدیبی عیراقی |
| | باشکۆی هەفتانەی ـ | گۆڤاری تووتن |
| | ڕۆژنامەی عیراق . | کاری میللی |
| | | بەیان |
| | | دەفتەری کوردەواری |
| | | برایەتی |
| | | شۆڕشی کشتوکاڵ |
| | | زانیاری |
| | | گیتی پوول |
| | | خەباتی قوتابیان |

| شوێن | ڕۆژنامە | گۆڤار |
| --- | --- | --- |
| | | نووسەری کورد |
| | | ڕۆژی کوردستان |
| | | پەروەردەو زانست |
| | | ڕوانگە |
| | | هوشیاری کرێکاران |
| | | گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات |
| | | ڕۆشنبیری نوێ |
| | | گوڤاری کۆڕی زانیاری کورد |
| | | ئامانج |
| | | ئەستێرە |
| | | پاشکۆی شۆڕشی کشتوکاڵ |
| | | نووسەری کورد ( خولی دووەم ) |
| | | نووسەری کورد ( خولی سێیەم ) |
| | | ڕەنگین |
| سلێمانی | پێشکەوتن | زاستی |
| | بانگی کوردستان | نیشتمان |
| | ڕۆژی کوردستان | نەورۆز |

| شوێن | ڕۆژنامە | گۆڤار |
|---|---|---|
| | بانگی حەق | بلێسە |
| | ئومێدی ئیستیقلال | هیوای کوردستان |
| | ژیانەوە | هونەر |
| | ژیان | ڕۆژی نوێ |
| | زبان | ڕابەر |
| | ژین | گزنگ |
| | بڕوا | سلێمانی |
| | مەشخەڵی نەورۆز | چیا |
| | ڕاپەڕین | ڕزگاری |
| | ژین | تیشکی هونەر |
| | باشکۆی برایەتی | دەنگی مامۆستا |
| | برایەتی | چیا |
| | | ئەستێرە |
| | | زانکۆ |
| | | تریفە |
| | | ڕەنجی کرێکار |
| | | گوڵاڵە |
| | | ئاسۆی زانکۆیی |

| شوێن | ڕۆژنامە | گۆڤار |
| --- | --- | --- |
| | | کاروانی ئافرەت |
| هەولێر | هەتاو | ڕووناکی |
| | هەولێر | هەتاو |
| | هەولێر | ژیان |
| | کاروانی وەرزش | تیشک |
| | | هەولێر |
| | | ڕهێڵە |
| | | نووسەری نوێ |
| | | بیری نوێ |
| | | بۆپێشەوە |
| | | ڕۆشنبیر |
| | | ئۆتۆنۆمی |
| | | کاروان |
| | | خانزاد ( بلاوکراوە ) |
| | | ئابووری زان |
| | | کشتوکاڵ |
| | | تەندروستی و کۆمەڵ |

| شوێن | ڕۆژنامە | گۆڤار |
|---|---|---|
| مەهاباد | کوردستان | نیشتمان |
| | ڕێگا | هاواری کورد |
| | | کوردستان |
| | | ئاوات |
| | | هەواری نیشتمان |
| | | گڕوگاڵی منداڵانی کورد |
| | | خۆرنشین |
| ئەستەنبۆل | کورد | کوردستان |
| | دیجلەو فورات | دەنگ |
| | ڕۆژی کورد | دەنگی تازە |
| | ژین | |
| | کوردستان | |
| | یەکبوون | |
| کەرکووک | ئازادی | شەفەق |
| | ڕای گەل | دەنگی قوتابیان |
| | | گزنگ |
| | | بابا گوڕگوڕ |

| شوێن | ڕۆژنامە | گۆڤار |
| --- | --- | --- |
| دهـۆك | | چیـا |
| | | ڕەوشەن |
| | | هیڤـی |
| ئەوروپـا | | کـوردستان |
| | | پرشنـگ |
| | | چیـا |
| | | ڕوناهـی |
| مووسڵ | ڕاستی | |
| قاهیرە | کوردستان | زیـن |
| ڕەواندوز | | زاری کرمانجی |
| گـەلاڵە | | بەرەو ڕووناکی |
| بۆکـان | | هەلاڵـە |
| ورمـێ | ڕۆژی کورد | کـوردستان |
| ئەنقـەرە | | ڕزگاری |
| یەریڤان | ڕێیـا تازە | |
| | ڕێیـا تازە | |

| شوێن | ڕۆژنامە | گۆڤار |
| --- | --- | --- |
| ساران | کوردستان | |
| حەلەب | | کوردستان |
| شام (دیمەشق) | | هاوار |
| | | ڕوناهی |
| | | ستێر |
| تەورێز | | نیشتمان |
| بەیرووت | | ڕۆژانو |
| | | ڕاستی |
| باکۆ | کوردستان | |
| هەڵەبجە | | شنروێ |

# فەرهەنگۆك

بارمتـــە : تأمينات

بڕبڕە : فقرە

پـــرۆ : نظـام

پەكخستراو : معطـل

پێ بژاردن : تغريم

تانـــە : طعن

جفـات : نقـــابە

جنێو تێهەڵدان : سب و قذف

خوازراو : مستعار

خۆ هەڵقورتاندن : تدخـل

داگرتنەوە : تعبئـة

ڕەشە كوژی : اغتيـــال

ڕێ پێدان : اجـــازە

زار : لهجـة

گۆڕانـكاری : تعـديل

مافەتە: طاعون

هاتنە ناو : انضمام

# سەرچاوەکان

**(آ) کتێبەکان :**


١ ـ عەبدولجەبار محەمەد جەباری / مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی/ چاپخانەی شارەوانی ـ کەرکووك ١٩٧٠ ٠

٢ ـ د٠ کەمال مەزهـەر ئەحمەد / تێگەیشتنی ڕاستیو شوێنی لـە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا / چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ بەغـدا ١٩٧٨ ٠

٣ ـ جەمال خەزنەدار / ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی / بەغدا ١٩٧٣

٤ ـ جەمال خەزنەدار/ڕۆژی کوردستان/چاپی بەغدا ١٩٧٣ ٠

٥ ـ جەمال خەزنەدار/بانـگی کوردستان/چاپی بەغدا ١٩٧٤ ٠

٦ ـ د٠ کـەمال فوئاد / کوردستان ـ یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی / بەغـدا ١٩٧٢ ٠

٧ ـ عەلائەددین سەجادی / مێژووی ئەدەبی کوردی / چـاپخانەی مەعاریف ـ بەغـدا ١٩٥٢ ٠

ح ـ شاکر فەتتاح / کۆمـەڵە ڕۆژنامەی جـەمجەماڵ / چاپخانەی ( الحوادث ) بەغـدا ١٩٨٣ ٠

٩ ـ شاكر فەتاح / ڕۆژنامەی ئاکرێ / چاپخانەی (الحوادث) بەغــدا ١٩٨٤ •

١٠ـ عیزددین فەیزی / یەکێتیی نووســەرانی کوردو دوو کۆڕ / چاپخانەی شارەوانی ـ هەولێر ١٩٨١ •

١١ـ محەمەد حەســەن مەنــگوڕی / کۆڵەکەی ڕۆژگــار / چاپخانەی ( اللواء ) بەغــدا ١٩٦٨ •

١٢ـ عوسمان شارباژێڕی / گوڵشەن / چاپخانەی شیمال ـ کـەرکووك ١٩٦٩ •

١٣ـ مومتاز حەیدەری / مستەفا شەوقیو پەیژە / چاپخانەی ( الادیب ) بەغــدا ١٩٨٥ •

١٤ـ د• عزالدين مصطفى رسول / حول الصحافة الكردية/بغداد ١٩٧٣

١٥ـ قيس عبدالحسين الياسري / الصحافة العراقية والحركة الوطنية منشورات وزارة الثقافة والفنون / بغداد ١٩٧٨ •

١٦ـ زاهيدة ابراهيم / كشاف الجرائد والمجلات العراقية / منشــورات وزارة الاعلام / بغـداد ١٩٧٦ •

١٧ـ فائق بطي / صحافة الاحزاب وتاريخ الحركة الوطنية / مطبعــة الاديب بغــداد ١٩٦٩ •

١٨ـ يعقوب يوسف كوريا / حكايات عن الصحافة في العراق / الجزء الاول بغــداد ١٩٦٩ •

١٩ـ وزارة الاعلام / مديرية الاعــلام العامة / دراسات في الصحافــة العراقية / بغــداد ١٩٧٢ •

٢٠ـ وزارة الاعلام / مديرية الاعلام العامة / دليل الصحافة العراقيــة بغــداد ١٩٧١ •

**(ب) ڕۆژنامەو گۆڤارەکان :**

چەند ژمارەیێك لەم ڕۆژنامەو گۆڤارانە :

١ ـ ڕۆژنامەی ( برایی ، خــەبات ، دەنــگی کورد ، هاوکـــاری ، برایەتی(١) ، بیری نوێ ، ژین ، کـــاروانی وەرزش ، عیراق ، ڕێگای یەکێتی ، پاشکوی عیراق ، التآخي ، العراق ) .

٢ ـ گۆڤاری ( گەلاوێژ ، هەتاو ، چیا ، بەیان ، تیشك ، دەفتــــەری کوردەواری ، هەولێر ، برایەتی ، شۆڕشی کشتوکاڵ ، زانیــاری ، دەنـــگی مامۆســـتا ، نووســـەری کـــورد(٢) ، ڕۆژی کوردستان ، پەروەردەو زانست ، ڕەێلە ، ڕوانــگە نووســـەری نوێ ، بەرەو ڕووناکی ، بیری نوێ ، کۆلیجی ئەدەبیات ، بۆپێشەوە ڕۆشنبیر ، ڕۆشنبیری نوێ ، کۆڕی زانیاری کورد ، ئەستێرە ، ئۆتۆنۆمی ، زانـکۆ ، رزگاری ، ڕەوشەن ، تیشـــکی هونـــەر ، گوڵاڵە ، ڕەنجی کرێــکار ، پاشکۆی شۆڕشی کشتوکاڵ ، شنروێ ، کاروان ، کشتوکاڵ ، تەندروستیو کۆمەڵ ، ڕەنگین ) .

---

(١) ڕۆژنامەی برایەتی بە هەموو خولەکانیەوە .

(٢) گۆڤاری نووسەری کورد بە هەر سێ خولەکانیەوە .

# پێرست

